. عەلی وەردی

# کەسێتی تاکی عێراقی



## تۆژینەوەیەکە سەبارەت بەباری دەروونی گەلی عێراق

## لەبەر ڕۆشنایی کۆمەلزانی نوێدا

وەرگێرانی لە عەرەبی یەوە
محمد وەسمان

ی یەکەم
٢٠٠٤

هزری د. عەلی وەردی زۆر لەوە پڕ ڕەهەند ترە بتوانین لە پێشەکییەکی چەند لاپەڕەییدا بیانخەینە ڕوو، بەلام سەر قەلەمێک لە مەڕ هەندێ لایەنی ئەم کەسایەتییە زانستییە دەنووسینەوە.

د. عەلی وەردی لە سالی ۱۹۱۳ لە کازمییە لە بەغدا لە دایک بووە، لە سالی ۱۹٤۸ ماجستێر و لە سالی ۱۹۵۰ دکتۆرای لە زانکۆی تەکساسی ئەمەریکی وەرگرتووە.

تێزنامەکەی لە سالی ۱۹۸۱ لە ئەمەریکا بلاوکراوەتەوە، کتێبەکانی بۆ دەیان زمانی زیندووی جیهان وەرگێڕدراون.

ڕۆژی ١٤ی تەمووزی ۱۹۹۵ ڕۆژنامەکان هەوالی کۆچی دوایی ئەم بلیمەتەیان ڕاگەیاند. بەگشتی د. عەلی وەردی لە بەر ڕۆشنایی سێ تیۆرییدا هەولیداوە دیاردەکانی کۆمەلگەی عێراق ڕاڤەبکات.

یەکەم ـ ( دووانەتی کەسایەتی، کەلە (مکایفر)ی وەرگرتووە).

دووەم: (کێشە و ململانێی نێوان دەوارنشینی و شارستانی)، کە لە (ئیبن خەلدوون)ی وەرگرتووە.

سێیەم: (نەسازیی کۆمەلایەتی) کە لە (نوکبرن)ی وەرگرتووە.

وەردی ئەم سێ تیۆرییەی کوێی نەکردووە لە شیکردنەوەی کۆمەلگەی عێراقی، بەلکو هەولیداوە دووبارە بنیاتیان بنێتەوەو بیانگونجێنێ لەگەل سروشتی تاکی عێرقیدا.

## کتێبەکان

د. عەلی وەردی لە کتێبەکانیدا گەشتێکت پێدەکات لە کەش و هەوای دەروون و گۆشە شارەوەکانی و ئەو دیوو دەروون. بابەت گەلێک بەناونیشانەکانیان نزیک دەبنەوە یان دوور دەکەونەوە لە شیکاریی دەروونی، بەلام کە تیایدا ڕۆدەچیت،

بەدوای پاژەکانیدا دەگەڕێت و لە دەرگای هزری وەردی دەدەیت، ڕێجگەیەکی دیکە وەردەگرن، ئەزموونگەی بیرو بۆچوونەکانی دەکەیتەوە، زۆرجاران ڕەهەندی وات بۆ دیاریدەکات لە ناونیشانەکانیان سەرسام دەبیت. بالەو کتێبەی دەست پێبکەین (کەسێتی تاکی عێراقی) کە لە ساڵی ١٩٥٠ چاپکراو و دواجار لە (٢٠٠١) چاپکراوەتەوە ئەم کتێبە پێشگۆییەکە، زیاتر بەوتاری ئەدەبی دەچێت لەوەی توێژینەوەی زانستی بێت، لەسەر بنچینەی هزرکێشەکێ و واتاگری نووسراوەتەوە،

خوێنەر سەرنج دەدات کەوا لە دوو بەشی سەرەکی پێک هاتووە، بەشی یەکەم، مەبەست تیایدا توێژینەوە بووە لە کەسایەتی مرۆیی بەشێوەیەکی گشتی. بەشی دووەم تایبەتە بە توێژینەوە لە کەسایەتی تاکی عێراقدا.

لەبەشی یەکەمدا توێژەر هەوڵدەدات کەسایەتی مرۆیی بخاتە ڕوو وەک کۆمەڵگە دروستی دەکات، لەبەر ئەم هۆیە تاکەکەسی هەر تاکە کەسێک . لە ڕاستیدا دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی ئەو کۆمەڵگەیەی کە تیایدا دەژێیت . لەم بەشەدا، لایەنی تاکەیاتی لە کەسایەتی فەرامۆشکراوە، بایەخی بەلایەنی کۆمەلایەتی داوە.

لە توێژینەوەی کەسایەتی تاکی عێراقیدا هەوڵی داوە لە کۆمەڵگەی عێراقی بکۆڵێتەوە بۆ ئەوەی بزانێت پێگەیشتنی کەسایەتی تاک چۆنە لەبەر ڕۆشنایی کۆمەڵزانی نوێندا. د. وەردی لەم کتێبەیدا مەبەستی کەم کردنەوە نییە لە کەسایەتی تاکی عێراقی بەڵکو مەبەستی وریاکردنەوەیەتی کە ئاگاداری ئەم کەموکورتیانەی کەسایەتییەکەی بێت بۆ ئەوە بەردەوتی کات بتوانێت لێی ڕزگاربێت.

ئەم بارودۆخەی کەتیایدا ژیاوە لە چەندان سەدەدا هەر گەلێکی دیکەی تێدا بوایە هەروا دەبوون. (ئەم تایبەتمەندییە هەر لە عێراقدا نییە بەڵکو هەتا لە کۆمەڵگەی ئەمەریکیش تێیدایە. لە بەر ئەوەی کەوتۆتە نێوان دوو ڕۆشنبیری دژ

بەیەک یەکێکیان بانگەواز بۆ ناسکی و نەرمی و خۆشەویستی دەدات و ئەوەی دیکە بۆ توندو سەرکەوتن و دوژمن لە ناو بردن دەدات. تاکی ئەمەرکی کەوتۆتە ژێر باری ئەم نەسازییە کەوا زانای ئەمەریکی (کمبال یانگ) لە کتێبەکەی «دەروونزانی کۆمەلایەتی» ۱۹٤۷ ئاماژەی بەوەداوە. (د. عەلی وەردی. )
هۆکاری ئەم دووانەتییەتی لە کۆمەڵگە کەماندا ئابووری نییە، بەڵکو کۆمەلایەتییە واتە دوانەتی لە دابونەریت و بە هاکان پەیدا دەبێت کەوا تاکە کەسەی پێ پەروەردە دەبێت لە دەوروبەری کۆمەلایەتیدا. واتە دەووانەتی لە ئاکامی بوونی دوو رۆشنبیری لێکدژ لە کۆمەڵگەدا پەیدا دەبێت، مرۆ لە منداڵییەوە لەسەری رادەهێندرێت، کە گەورە بوو تووشی دوانەتی دێت و پێی نازانێت، هەندێ جار باوەری بە رۆشنبیری یەکەم هەیە و هەندێ جار بەوەی دووهەم. دووانەتی لەکەسایەتیدا ئەمرۆ خۆی لە دیاردەیەک دەبینێتەوە کە باوەربوونە بە  بە هاو بنەماکانی ژیاری نوێیە ، وەک دیموکراسی، یەکسانی، دادپەروەری کۆمەلایەتی و ئازادی ئافرەت و ئەم جۆرە بەهایانەو و بانگەواز دان بۆ ئەم بنەمایانە، کەچی دەبینین کە سایەتی دووانەتی لە ژیانی رۆژانەیدا لە خەڵکی رەشۆکی جیاواز نییە لە رووی باوەر بوونی بە دەمارگیری و بەها کۆنەکان و سرینەوەی نەنگی و واستەکردن و هتد.

## ئەفسانەی ئەدەبی باڵا

دواچاپی لە ۱۹۹٤ بوو ناونیشانە کە خوێنەر دەباتە کەش و هەوایەکی دیکە، کتێبەکە گفتوگۆیەکی هزری گرنگە لە نێوان دوو فێرگە، یەکەمیان شانازی بە شیعرو زمان دەکات تا پلەی وشکەباوەری و دەمارگیری و دووەمیان کە نووسەر یەکێکیانە رەخنە لە شیعر و ئەدەبی سوڵتانی و رێزمانی ئاڵوز دەگرێت کە زمانزانانی کۆن دایانناوە.
کتێبەکە گفتوگۆ لەسەر کاریگەری ئەدەب و زمان دەکات لەسەر کۆمەڵگەدا،

بەتایبەتی کۆمەڵگەی عەرەبی، بەتایبەتی بایەخدانی خەلیفە و سوڵتانەکان بەو بابەتە، تا وایلێهاتووە لە هەموو نەتەوەکانی دیکە زیاتر بایەخ بە شیعر بدات، کتێبەکە هەوڵدانکە بۆ ئازادکردنی زمانی عەرەبی و ئاسان کردنی ڕێزمانەکەی و ئازادکردنی کۆمەڵ لەو دەسەڵاتە کە هێشتا بەسەریدا زاڵە.

## «واعیزەکانی سوڵتان»

لەم کتێبەدا وەردی زۆرشت دەخاتە روو لەوانە دەڵێت لۆجیکی ئامۆژگاریی ئەفلاتوونی، کە لوجیکی ناڕوات بەڵکو لەسەر بنچینەی پێکهاتەی سروشتی مرۆڤ لە کاردایە، کە لە چەندان ڕێچکەی بنجی پێکدێت کە ناگۆڕدرێت و ناکار کە ناکامێکن لە ناکامەکانی بارودۆخی کۆمەڵایەتی.

ئەم کتێبە چەند بەندێکی کورت بووە نووسەر ویستی لە ئێزگەی عێراقدا بڵاویان بکاتەوە، بەڵام ڕێیان پێنەدا، بوونە هەوێنی ئەم کتێبە کە ئێستا لە بەر رۆشنایی رابردوو ئێستا دەخوێنێتەوەو هەڵەکانی ئەمڕۆ لەسەر پەروەردەی رابردووی چەندان سەدە بنیاتنراوە و دووانەتییەکەی سەپاندووە، دەروونی مرۆیی هەندێ ڕەنگی ناشۆر درێت، لەبەر ئەوە لە جل و بەرگ و پێست زیاتر رۆچووە لە چاڵێکدا تەمەنی دەیان سەدەیە رەنگی پێش بۆنی بۆگەنی دەردەکەوێت.

کەسایەتی ،عەرەبی دووفاقیە، کەسی دوو ڕووو دووانەتییە لە کارو گفتاری و ئاگای لەوە هەیە و بۆ مەبەستی خۆی وادەکات، بەڵام کەسایەتی دووفاقیە (دووانەیی) ئاگای لەم دووانییەی کەسایەتییەکەی نییەو نازانێت، لەبەر ئەم هۆیە خاوەن کەسایەتی دووفاقی ڕووبەڕووی ململانێی دەروونی دەبێتەوە، هزری نموونەیش لە خزمەتیدایە، درۆشمە نموونەییەکان، دووڕووی و خۆو ویستی و خراپەکاری دەشێرنەوە، مرۆڤ مەلایکەت نییە، بەڵام کە دامودەزگای وەعزی ئەفلاتوونی داوای ئەم مەلا بکەن بوونەی لێ دەکەن لە ئەرکی راستینەی لا دەدات و زۆرداران نیازە خراپەکانیان دێنەدی لە پەنائەو نموونە خوازییە درۆزنەدا.

## خەون، لە نێوان زانست و باوەڕدا
## دواچاپ ١٩٩٤

د. عەلی وەردی لەم کتێبەدا هەوڵدەدات بە شێوەیەکی زانستی مێژوویی و جوان لە خەون بکۆڵێتەوە، بابەتێک بەشێوەو ناوەڕۆکی و رووژێنەرە، لەبەر ئەوەی هەموو خەڵک دەگرێتەوە لە هەموو ئاستەکاندا. ئەم کتێبە باس لە خەونەکان دەکات لە لایەنی کۆمەڵایەتییەوەو کاریگەری لەسەر کۆمەڵگە، دوای خستنە رووی بیروڕای کۆنینەکان سەبارەت بە خەونەکان و بیرو بۆچوونی موسڵمانان و کاریگەری خەون لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا و کاریگەری لەسەر هەندێ بیرو باوەڕی ئیسلامی تا پلەیەک خەون بەڕاست بزاندرێت و هیچ ناڕەزایی بەرامبەر دەرنەبڕێت، دواتر توێژەر بیروڕا نوێکان سەبارەت بەخەو دەخاتە روو هاوشان لەگەڵ خستنە رووی گرنگترین ئەو تیۆریانەی کە باسی بابەتەکە دەکەن لەبەر رۆشنایی شیکاریی دەروونزانی، و زانستی پاراسایکۆلۆژی، و تیۆرییەکانی پارایی (وندایەتی = غەیب بینی).

## فرە توانایی نەست، یان نهێنییەکانی کەسایەتی سەرکەوتوو
## دواچاپ: ١٩٩٦

د. وەردی لە لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا لە نهێنییەکانی بلیمەتی و سەرکەوتن و لێهاتووی دەکۆڵێتەوە، یان ئەوەی لەلای خەڵک بە (بەخت) ناسراوە، و کاریگەری هاندەرە نەستییەکان لەبەر رۆشنایی تیۆرییە زانستییەکان دکتۆر زۆر لایەنە بەسەر دەکاتەوە، بەگشتی دەڵێت: بەمەبەست و بەتەکلیف و بە خوازو پەلەکردن کۆمەڵە شتێکی دژی هاندەرەکانی نەست و زیانیان پێدەگەیەنێت..

زۆر هۆکاری سەرکەوتن لە گوێ گرتن و لەبەر چاوگرتنی نەستەوە دێت و سرووشە هەنووکییەکەی، گەر مرۆڤ پەلەی لە شتێکدا کردوو ویستی خۆی بۆ ماندوو بکات، بەو کارەی سرووش نەست خەفە دەکات و لە رێگای شکست

هێناندا دەڕوات.

گۆڕانی کۆمەڵگەی مرۆیی لەو هاوچاوییەتوندەوە دێت کەوا هاندەری هەموو تاکە کەسێکە بۆ ئەوەی کارامەبێت و لەوانی دیکە سەرکەوتووتر بێت، گۆڕان لە دوای خۆیدا زۆران جێدەهێڵێت ئەوانەی لە ژیاندا شکستیان هێناوە زانستیانە دەرکەوتووە کەوا رادەیەکی زۆر لەو کارە ئەمرانەی ئەم سەرکەوتووانە و بلیمەتەکان کردوویانە لە ئاکامی ئەو سرووشەوە هاتووە کە لەناخی ئەستەوە هەڵقوڵیوە».

## بەم جۆرە قورەتولعەینیان کوشت
## دواچاپی ۱۹۹۷

باسی رووداوەکانی کۆمەڵگەی عێراقییە لە دواساتەکانی والی بەغدا نەجیب پاشا کە باسی ئافرەتێکی سەیری تێدا باو بوو ئەویش (سۆمای چاوان) (قرة العین) بوو ئەم ئافرەتە پەچەی لە رووی لاداو لەسەر مینبەراندا دواو گەنگەشەی کرد، رووداوێکی گرنگ و تاکی عێراق بوو دەشێ دەیان سەدەوە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست یەکەم رووداو بووبێت لە.

لەم کتێبەدا وەردی تیشک دەخاتە سەر ئەم کەسایەتییە و قۆناخەکانی ژیانی و رووداوەکانی ژیانی کە کاریگەری هەبوو لەسەر ناوەندە ئاینییەکان لە عێراقدا.

تا لە کۆتاییدا دەگاتە گرتنی و کوشتنی.

ئەمەو دەیان کتێبی دیکەو وتاری دیکەی د. عەلی وەردی شایانی ئەوەن بکرێنە کوردی و لەبارەیان بنووسرێت، بەڵام وەک دەڵێن رەوتی میلێک بە هەنگاوێک دەست پێدەکات.

ناڵێم ئەم پێشگۆییە (محاضرە) توێژینەوەیەکە هەموو مەرجە زانستییەکانی تێدایە. دەشێ بوترێت کەوا: پتر لەوتارێکی ئەدەبییەوە نزیکە نەوەک توێژینەوەیەکی زانستی بێت، بەهانەشم لەوەدا ئەوەیە:

پێشگۆییەکە بۆ ئەوە نووسراوە کەلەکۆڕێکی گشتیدا بخوێندرێتەوە.

لەسەرەتادا مەبەستمان نەبوو لەچاپی بدەین یان بەم شێوەیەی ئێستای بۆ خوێنەران بڵاوبکرێتەوە. کەواتە لەسەر بنەمای رەهاکردنی بیرو هزرکێشەکێ نووسراوە. واتە بەپێی ریزبەندی لۆجیکی لەچەندین بەش و بابەتی رێک و ئەلقەی یەک لەدوای یەک پێکنەهاتووە.

دەشێ خوێنەر لەدووتوێی ئەو بیرە جیاجیایانەی کەهیچ سیستەمێکیان تێدا نابینرێ رێگا بزربکات، بەهەرحاڵ دەکرێ خوێنەر دوابەدوای خوێندنەوەی پێشگۆییەکە بیری بۆ ئەوە بچێت کەوا دابەشی سەر دووبەندی سەرەکی کراوە؛ بەندی یەکەم: مەبەستم بەگشتی تیایدا لەکەسایەتی مرۆیی بکۆڵمەوە؛ بەڵام بەندی دووەم تایبەتە بەتوێژینەوە لە «کەسایەتی تاکی عێراقی». خوێنەر دەبینێت کەوا بەشی یەکەم درێژەی پێدراوەو دەشێ لەچەندان شوێندا لەبابەتەکەش دەرچووبم. لەوەشیان داوای لێبوردنی بۆناکەم چونکە دەکرێ وابکەم و مکوڕیم لەسەری.

لەراستیدا بیرم بۆ ئەوەچوو کەوا ناتوانم لەکەسایەتی عێراقی بکۆڵمەوە ئەگەر پێش ئەوە بەوردی لەکەسایەتی مرۆیی نەکۆڵمەوە. سەرەڕای ئەوەش بەگشتی بابەتی کەسایەتی لەزمانی عەرەبیدا توێژینەوەی تێروتەسەلی لەسەر نەکراوە، زۆربەی ئەوانەی لێی توێژیونەتەوە پسپۆرانی دەروونزانی بوونە. ئەمەش واتای ئەوەیە کە کەسایەتی تەنیا لەلایەن تاکایەتیەکەی لێی توێژراوەتەوەو کەمێکیان نەبێت بایەخ بەلایەنە کۆمەڵایەتیەکەی نەدراوە. سەرەرای ئەوەش ئەوشتەی کەپێویستە لەبیری نەکەین ئەوەیە کەوا کەسایەتی لەدەروونزانیدا چەمکێکی خۆی هەیەو جیاوازە لەهەمان چەمک لەکۆمەڵزانیدا، یان لەزانستی شارستانیەتیدا (ژیاری).

دەروونزانی وەک تاکێکی خۆکار دەروانێتە مرۆڤ بۆیە لەم رووەوە لەکەسایەتی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە بەوەی کەوا کۆمەڵێکە لەوسیفەتە تایبەتیانەی کەتاکێک لە یەکێکی دیکە جیادەکاتەوە. ئەوەشیان چەمکێکی تارادەیەک راستە، بەڵام زانایانی کۆمەڵناسی ئەوەشیان خستۆتە سەر کەوا کەسایەتی لەزۆر روویەوە نوێنەری کۆمەڵگەیە؛ بەڵکو ئەمڕۆ لەسەر ئەوە کۆکن کەوا تاک و کۆمەڵ دووڕووی یەک راستین، یان وەک (کولی) دەڵێت: تاک و کۆمەڵ دوو جمکن بەیەکەوە لەدایک دەبن.

کەواتە کەسایەتیی مرۆڤ لەچەندان قاڵب دادەرێژرێت کەوا کۆمەڵگا دروستیان دەکات هەرلەبەر ئەم هۆیە یە کەوا دەبینین رۆڵەکانی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو لەزۆر سیفەتی کەسایەتیان وەک یەکن. بەڵام ئاساییەکە جیاوازییەکەیان لەهەندێ وردە سیفاتی گشتی دا دیاریێت. جیاوازیەکی وا کەوادەکات هەریەکەیان کەسایەتیەکی تایبەتی خۆی هەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەهێڵە سەرەکیەکانی ئەم سیفاتانە وەک یەکن. لەوانەیە توانیبێتم لەبەشی یەکەمی ئەم دوانیێژیەدا ئەم لایەنە گرنگەی کەسایەتی بخەمە بەردیدی خوێنەرو بۆی روون بکەمەوە کەوا تاکەکەس لەراستیدا دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی ئەو کۆمەڵگەیەی کەتیایدا دەژیێت، کەواتا لەم بەشەدا لایەنی تاکایەتیم لەکەسایەتیدا فەرامۆش کردووەو زەینی خۆم داوەتە لایەنە کۆمەڵایەتیەکە. مەبەستیشم ئەوەنیە کە یەکاویەک نیشانەم پێکابێت بەڵکو مەبەستم ئەوەبوو کە سەرنجی خوێنەر... بۆ لایەنێک رابکێشم کەلەپێشوودا ئاوڕی لێ نەداوەتەوە.

کەدەستم بەلێکۆڵینەوە لەکەسایەتی تاکی عێراقی کرد، تووشی دژوارییەکی گەورە هاتم ئەویش دۆزینەوەی تایبەتیەکان و هەڵواردەکانی کۆمەڵگەی عێراقی یە کەوادەکات نموونەیەکی دیاریکراو لەکەسایەتی بێنێتە بەرهەم و جیاوازە لە کۆمەڵگاکانی دیکە.

زۆر لەتوێژەرەوانی عێراقی و بیانی هەوڵیانداوە تایبەتیەکانی ئەم کۆمەڵگەیە بدۆزنەوەو هەریەکێکیان رایەکی تایبەتی هەبووە کەوا جیاوازبووە

لەرای ئەوانی دیکە. هەموویان هەوڵیانداوە وەک پزیشکان دەردی ئەم نەخۆشە بدۆزنەوە، بەڵام بەداخەوە ڕێک نەکەوتوون لەسەر ئەو ڕێبازەی کەنیشانەکانی ئەم نەخۆشەی پێ بنۆڕن.

ئەوانە یان ئەوەتا ئەدیب بوون یان مێژوونووس یان گەشتەوەر یان ڕۆژهەڵاتناس، بەڵام کەمێکیان نەبێت هەوڵیان داوە کەلەبەر ڕۆشنایی دەروونزانی یان کۆمەڵزانی یان شارستانیەتزانی لە نەخۆشییە بکۆڵنەوە وەک ئەوکەسە وابوون کەهەوڵدەدات نەخۆشیەک بپشکنێت، بەڵام لە زانستی پزیشکیدا هیچ نەزانێت.

ئەم دووانبێژییە هەرچەندە کەم و کورتیەکی بەرچاوی تێدایە لەرووە زانستیەکەی هەوڵدانێکە لەرێگای پشکنینی کۆمەڵگەی عێراقی لەبەر ڕۆشنایی کۆمەڵزانی نوێ بۆ زانینی چۆنیەتی پێگەیشتنی کەسایەتی تاک تیایدا .

بۆ ئامادەکردنی ئەم دووانبێژییە زۆر ئازارم کێشا لەبەر ئەوەی لە ئەم ڕێگایەی کەگرتبوومەبەر هیچ کێڵەڕێیەکم نەبینی کەرێ نیشانەرببێت وەک ئەوەم هاتەبەرچاو کەرێگەیەکی نوێ دەکەمەوە کەکەس لەوەوپێش پێی لێنەنابێت.

هەرچۆنێک بێت ئەمە هەوڵدانێکی سەرەتاییەو داوا لە خوێنەر دەکەم بەتوندی ڕەخنەی لێ بگرێت و بەچاوێکی گومانەوە سەیری بکات دەشێ زێدەڕۆییم نەکردبێت ئەگەر بڵێم ئەمە یەکەم هەوڵدانە لەم ڕێگایەداو بەم شێوازە دەنرێت.

ناڵێم ئەم هەوڵە لەرووی زانستییەوە سەلمێنراوە، بەڵکو گیروگرفتێکی مرۆڤە، کە ناتوانێت یەکسەر بگاتە ڕاستی، دەکرێ بڵێین: هەڵە ڕێگای گەیشتنە بەڕاستی ، کەواتە ئەوەی مەبەستمە لەم هەوڵدانە هاندانی کەسانی دیکەیە بۆ لێکۆڵینەوە لەم بابەتە گرنگەو وروژاندنی هەندێک لەهزرمەندانمانە بۆ ئەوەی کەمێک لەبورجە عاجییەکان دابەزنە خوارەوەو تێکەڵ بەکۆمەڵگەی عێراقی ببن بۆ توێژینەوەو لێگەڕان بەشێوەیەک بێزیان لەنزیک بوونەوەیان نەبێتەوەو خەڵکی ڕەش و رووت بەکەم نەزانن.

## خوشکان برایان:

پێش ئەوەی لەکەسایەتی تاکی عێراقی بکۆڵینەوە پێویستە بەگشتی لەچەمکی کەسایەتی بکۆڵینەوە. کەسایەتی لای زانایان چەمکێکی تایبەتی هەیەو جیاوازە لەبۆچوونی خەڵکی بۆ چەمکەکە.

خەڵکەکە بەهەڵەڕاهاتوون کاتێک یەکێکیان بەئەوی دیکە دەڵێ فلان کەسایەتی نییەو بەیەکێکی دیکەش دەڵێ فلان خاوەن کەسایەتییە، وەک ئەوەی کەسایەتی وەک جوانی وابێت هەندێ کەس هەیەتی و هەندێکی دیکەش نیانە.

لەراستیدا هەریەک لەئێمە خاوەن کەسایەتیەکی تایبەتی خۆیەتی کەس نییە بێ کەسایەتی بێت. جیاوازی لەنێوان کەسێک و کەسێکی دیکە لەبەهێزی کەسایەتی دایە یاخود لەبێ هێزی کەسایەتیەکەدا نەوەک لەبوون و نەبوونیدا، ئێمە لەم ئێوارەیەدا مەبەستمان لەبابەتی کەسایەتی لەرووی بێ هێزی و بەهێزیەوە نییە. دەشێ رۆژێکی دیکەی بۆ تەرخان بکەین و تیایدا لەم لایەنە بکۆڵینەوە.

توێژینەوەکەمان ئێستا لەبارەی چییەتی (ماهیەتی) کەسایەتی دایە بەگشتی و تایبەتیەکانی کەسایەتی تاکی عێراقی بەشێوەیەکی تایبەتی. دەشێ یەکێکیان بپرسێت ئەوشتە چیە کەپێی دەڵێن کەسایەتی، ئەگەر هەریەک لەئێمە کەسایەتیەکی تایبەتی خۆی هەبێت کەواتە ئەمەیان لەکوێیە؟

سەرچاوەکەی چییەو بنچینەکەی کامەیەو چۆن دەتوانین لەخۆماندا هەستی پێ بکەین و بزانین کەبەراستی لەئێمەدا هەیە؟

جارێکیان برادەرێکم بەچرپە پێی گوتم وەک ئەوەی بترسێت ئەوەک کەسێکی دیکە گوێی لێ بێت:« برایەکەم زۆر جاران گوێ بیستی کەسایەتی دەبم خۆم وانیشان دەدەم کەتێی گەیشتووم نەوەک لێم بەخەوش بگرن ! بەڵام لەراستیدا هیچی لێ تێناگەم؟ دەکرێ پێناسەیەکی کورتم بۆ بکەی بۆ ئەوەی کەباس هاتە سەرباسی کەسایەتی بتوانم لەگەڵ خەڵکدا لێی بدوێم.»

**خوشکان برایان:**

ئەو برادەرەم کەئەو پرسیارەی لێکردم لەکاتێکدا بوو کەمن هەر ئەوەندەی ئەو لەکەسایەتی دەگەیشتم، هەرچۆنێک بێت هەوڵم دا هەندێک پێناسەی باوی پێشکەش بکەم. بەڵام لێم تێنەگەیشت لەراستیدا من خۆم لەوەتێنەدەگەیشتم کەخۆم دەمگوت، ماوەی کاتژمێرێک گفتوگۆمان بوو، بەڵام بێ سوود بوو لەکۆتاییدا دانم بەوەدانا کەهیچی لێنازانم و بەناسوودەیی لێی خەوتم.

ئەم چیرۆکە وێنەیەکی بچووکی زۆربەی هەرەزۆری رۆشنبیرو قووتابیانە لەبارەی بابەتی کەسایەتی هیوادارم بتوانم لەتوێژینەوە لەکەسایەتی لەگەڵ ئێوەدا سەرکەوتووتربم بەشێوەیەکی باشتر لەوشێوەی کەلەگەڵ برادەرە خۆشەویستەکەم تێی دابووم.

پێناسەو دیارکردنی کەسایەتی کارێکی ئەوەندە ئاسان نییە بەڵکو وەک کارەبا یان ئەسیر یان موگناتیز وایە تەنیا بە شوێنەوارەکانی ددناسرێت. (١)

شیکردنەوەی کسایەتی بۆ توخمە بەرایییەکانی ئەوەندە ئاسان نییە، ئەگەر هاتوو شیکرایەوەو توخمەکانی لێک جیاکرانەوە ئەوا پێوەندیە ئۆرگانیەکەی لەدەست دەدات و بەهاگشتیەکەی نامێنێت. کەواتە وەک ئاوێتەیەکی کیمیایی وایەو چەندان سیفەتی تایبەتی خۆی هەیە کەجیاوازن لەسیفەتەکانی هەریەک لەوتوخمانەی کەلێی پێک هاتووە.

هەرچۆنێک بێت دەکرێ بەکورتی پێناسەی کەسایەتی بەم شێوەیە خوارەوە بکەین:

**کەسایەتی:**

« ئەو کۆمەڵە رێکخراوەیە لەبیرو داب و نەریت و وازو رەوشتانەی کەوا کەسێک لەئەوانی دیکە جیادەکاتەوە» (٢)

(مۆری) و (کلۆکۆهن) دەڵێن کەسایەتی مرۆیی پێکهاتەیەکی بزۆزەو هەوڵدانێکی بەردەوامە لەرێگای گونجاندنی نێوان ئارەزووەکانی سروشتی مرۆڤ و رێساکانی ئەو کۆمەڵگەیەی کەبەسەریدا سەپێنراوە. (٣)

**خوشکان برایان:**

کەمرۆڤ لەدایک دەبێت چەندان وازو هەڵپەی ئاژەڵی نارێکی پاشماکی (وراثی) بۆ دەمێنێتەوە. ئەم هەڵپە توندو تیژانە دەخرێنە ژێرکاریگەری بەها شارستانیەکان و کۆت و بەندە کۆمەلایەتیەکان، منداڵ هەوڵ دەدات بۆ خۆ گونجاندن لەنێوان ئەوەی ئارەزوویەتی لەپێداویستیە هەنوکەییەکان و ئەوەی کە کۆمەڵگە بەشەریدا دەسەپێنێ لە چاکسازی و داب و نەریت و بەهاکان. واتە ململانێیەکی بەردەوامە لەنێوان دووهێزی دژیەک: هێزێکی ئاژەڵی کەگوێ بەهیچ کۆت و بەندێک نادات و رەچاوی هیچ شتێ ناکات، لەگەڵ هێزێکی دیکەی کۆمەلایەتی، کە هەوڵدەدات بەسەر ئەو هێزە توندڕۆیە زاڵ بێت و بیخاتە قاڵبە شارستانیە خوازراوەکانیەوە.

کەسایەتی وەک فرۆید دەڵێ: ململانێی نێوان دوو خودە: خودی باڵاو خودی نزم. هەندێ کەس لە پرۆسەی چاکسازی و گونجاندنی ئەم دوو هێزە دژیەکە سەرکەوتن وەدەست دێن. کەواتا کەسانێک هەن لەنەنجامی سەرنەکەوتنیاندا . یان ئەوەتا شێت دەبن ! یان دەبنە تاوانبار، یان گۆشەگیر، یان بەرەڵلا یان دەستدرێژیکەری دڵرەشن.

ئەوەی بەرچاوە پیاوانی ئایینی و بیرمەندان هەرلەکۆنەوە بەم راستیەیان زانیوەو دەروونی مرۆڤیان بە مەیدانێکی ململانێی توندی نێوان رێگای خوداو دڵەڕاوکێی شەیتان، یان وەک فەیلەسوفەکان دەڵێن ململانێی نێوان سروشی ئاوەزو هەڵپەی سۆزداناوە.

بەڵێ لەکۆنەوە ئەم راستییە لەبارەی کەسایەتی زانراوە، بەلام ئەوان نەیانتوانیوە واقیعیانە لە کەسایەتی بکۆڵنەوە. تەنیا خەریکی ئامۆژگاری و رێ نیشاندان و داوایان لەخەڵک دەکرد کەوا ژیرانە هەڵس و کەوت بکەن و چاکەخوازبن بە بێ ئەوەی هەتا تروکەیەک بوەستن و بیر لەوهۆیە بکەنەوە کەژمارەیەکی زۆری خەڵکی لەگەڵ پێلی سۆزدا دەڕۆن و لەڕێی ئاوەزدا دەردەچن، یان بەدەستەواژەیەکی دیکە « دەکەونە دوای فەرمانەکانی شەیتان و پشتیان لەفەرمانەکانی خودا دەکرد».

دەگێڕنەوە دەوارنشینەک(ئەعرابیەک) ڕۆژێکیان بەلای کتێبخانەیەکی پڕ لەکتێبدا دەڕۆیشت و هاواری کرد هەموو ئەوەی لەم کتێبانەدا هەیە دەزانم: کە دەڵێت« ئەی مرۆڤ چاکە خوازبە!» یان وەک خۆی بەزاری خۆی گوتی:
«بنیادەم پیاوێکی باش بە».
ئەم قسەیەی کەئەو ئەعرابیە گوتی، لەڕاستیدا دەقاو دەق ئەو شتەیە کەکۆنینەکان دەیاننووسی و دەیان گوتەوە. بەڕاستی لەدۆزینەوەی ڕاستیە گەورەکەی سەر بەکەسایەتی مرۆیی سەرنەکەوت! ئەویش ئەوەی خوارەوەیە لەڕاستیدا فەرمانەکانی خودا فەرمانەکانی کۆمەڵگەیە، داب و نەریت و نموونە بەرزەکانیەتی ئەم داب و نەریت و بەهایانە هەرکاتێک دەسەلاتیان بەسەر دەروونی مرۆڤدا بێ هێزبوو، دەبینین ئەو مرۆڤە دەکەوێتە دوای وازە ئاژەڵیەکەی بەبێ ئەوەی ئاوڕ لەهیچ بداتەوە.
کەواتە کێشەکە گیروگرفتی نێوان ئاوەزو سۆز نییە وەک پێشینان لەسەر ئەو بڕوایەدابوون. بەڵکو لەڕاستیدا گیروگرفتەکە گیروگرفتی ترۆیکەرایی و هەڵوەشانەوەی سیستەمی کۆمەلایەتیە، کەمرۆڤ تێیدا دەژێت. ئەگەر کۆمەڵگە لەئاکامی بزاوتن و پەیوەندیکردنی بەکۆمەڵگاکانی دیکەوە دەسەلاتی نموونە بەرزەکانی تایبەتی خۆی بێ هێزبوون و لەبەر ئەم هۆیەوە تاکەکەسان بڕوایان پێی کەم بووەوەو کەوتنەدوای ئەوشتەی کەئارەزوویان لێیەتی و گوێیان نەدایە ئامۆژگاری دوانبێژەکان. سەرەڕای ئەوەش پێشینان لەوباوەڕەدابوون کەوا مرۆڤ ئازادە لەوەی کەدەیکات ئازادیەکی ڕەها، واتا : دەتوانێت کەسایەتیەکەی خۆی واپێکبهێنێت وەک خۆی دیەوێت! یان بیکاتە ئەوقاڵبەی کەخۆی دەیەوێت پێشینان دەیانگوت؛ مرۆڤ دەتوانێت لەخۆیدا هەموو سیفەتە باشەکان کۆبکاتەوەو سیفەتە خراپەکانیش وەلاوە بنێت. وەک ئەوەی کەسایەتی پارچە مۆمێک بێت چۆنی بوێت وای دابڕێژێت. ئاگایان لەوەنەبوو کەوا کەسایەتی بەپێی ڕێسایەک پێک دێت و پێدەگات و فرەجۆر دەبێت کە لێ لادانی زەحمەتە، لەسەرهەمان ڕێگا دەڕوات کەبۆی دیارکراوە بەپێی کارلێکردنی سروشت و کۆمەڵگە ئەگەر ئامۆژگاران ئامۆژگاریەکانیان بڵێن یان نەڵێن. بدوێن یان نەدوێن.
یان بیرمەندان هزرەکانیان دەربڕن یان دەرنەبڕن هەمووی بێ هوودەیە.

راستۆکی کەسایەتی بەپێوەری لۆژیکی رەها ناپێورێت کەوا پەندیاران لەئەندێشەیان دابوو. بەڵکو شتێکی رێژەییە، ئەگەر هاتوو مرۆڤێک لەکۆمەڵگەیەکی دیارکراودا پەروەردەبوو و بەهاو داب و نەریتەکانی وەرگرت شتێکی بێ هودەیە داوای لێ بکەین گوێ بداتە ئامۆژگاریەکانی پەندیاران کەجیاوازە لەگەڵ ئەوشتەی کەلەسەری راهاتووە.

ئیبن خەلدون دەڵێ: مرۆڤی کۆچەری پاڵەوانێکی ئازایەو جەنگاوەرێکی نەترسە. زۆرداری رەت دەکاتەوەو هاوسێ پارێزە، ئەم جۆرە سیفەتانەش لەگەڵ سیفەتەکانی زانست خوازی یان خۆراگری لەپیشەو هونەرەکانی بیناسازی ناگونجێت. بەرای ئەو کەسایەتی مرۆیی چەندان چەشنی هەیەو مرۆڤ ئەگەر لەچەشنێکی دیارکرابوو ناتوانێت بچێتەسەر چەشنێکی دیکە لەسەر ئەم بنەرەتەوە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەبڵێت زانستخوازی و لێهاتوویی لەپیشەسازیدا سیفەتی نەتەوە ژێردەست و ملکەچەکانە لەبەر ئەوەی سیفەتێکە پێویستی بەملکەچی و خۆراگری و کاری بەردەوام هەیە.

بۆیە ئەم هەڵاواردنەش ناسازە لەگەڵ سیفەتەکانی سەرفرازی و پاڵەوانی و فریاکەوتن کەلەسیفەتەکانی مرۆڤ دەدوێن، بەبیروڕای ئیبن خەلدون مرۆڤ لەیەک کاتدا ناتوانێت جەنگاوەرێکی نەترس و زانستخوازیش بێت. هەروەها ناتوانێت لەهەمان کاتدا پاڵەوانێکی سەربەرزو پیشەوەرێکی کارامەبێت.(٤)

وەک ئەوەی کۆمەڵگەی شارستانی بێت هاندەری داوێن پیسی و خاوەن هونەرو زانستەکان، لەهەمان کات تاوانباران و بەدکاران و بەرەڵایی هان بدات.(٥)

**خوشکان برایان:**

ئەم تیوریە هەرچەندە بەگوێرەی شارستانی نوێ زۆرلاوازە بەڵام تیژبینیەکی تێدایە لەبابەت کەسایەتی بەگوێرەی شاریتانیەتی کۆن لەهەمان کاتدا زەبرێکی بەهێزە دژی بیرکردنەوەی کۆن کەوا بۆ ئەوە دەچوو مرۆڤ دەتوانێت کەسایەتی خۆی چۆنی دەخوازێت ئاوا بنیات بنێت لەهەمان کات چ جیاوازیەکی هەیە تیایدا کۆبکاتەوە.

ئەم تیۆریەی ئیبن خەلدون وەک تروسکاییەک وابوو لەتاریکیدا هەڵدەکات و خێرا بزردەبێت لەبەر ئەوەی بەچەندان سەدە پێش سەردەمی خۆی کەوتبوو. هەرلەدوای مردنی خاوەنەکەی دنیا بابەتی کەسایەتی فەرامۆش کردو وەک چۆن ناوی ئیبن خەلدونیشی فەرامۆش کرد.

بیرمەندان دوای ئیبن خەلدون وەک چۆن لەپێش ئەویشدا وابوون خۆیان لەکەڵووە عاجیەکاندا حەشاردابوو و دەنگیان بەهۆی دوان و ئامۆژگاری و نووسینی رێنوێکارانە کەوتبوو، دنیا سەرلەنوێ لەسەردەمی رێنیسانسی ئەوروپیدا ئاوڕی لەبابەتی کەسایەتی دایەوە. لەبەرئەوەی لەوسەردەمەدا کاردانەوەیەکی توندو تیژی بیری کۆن و دژی هەموو زاراوەکانی سەدەکانی ناوەڕاست سەری هەڵدا، پاش ئەوەی کۆنەکان بۆ ئەوە دەچوون کەوا مرۆڤ ئازادە لەدروستکردنی کەسایەتیەکەی، هونەرمەندانی رێنیسانس بۆ ئەوە دەچوون کەوا کەسایەتی وەک ئامێرێکی میکانیکی وایە کەئەویست و ئەئازادی هەیە، چونکە لەگۆشەنیگای ئەوانەوە ئامرازێکە بەدەستی چوار ئاوێتەکەی جەستە واتا: خوێن و بەڵغەم و زەرداو و رەشاو (٦) ئەگەر یەکێک لەم ئاوێتانە لەراوەدەی خۆی لەجەستەدا زیادبکات ئەوا کەسایەتی سروشتی ئەم هۆکارە وەردەگرێت! واتا ئەم ئاوێتە زیادە کەسایەتی زەرداوی لەگۆشەنیگای ئەواندا رک ئەستورە خێرا تورە دەبێت و ویستی بەهێزە کەچی کەسایەتی بەڵغەمی هێمن و لەسەر خۆیە. تەمبەڵی و بێ باکی بەسەریاندا زاڵە، بەڵام کەسایەتی خوێنین کەسایەتییەکی کراوەو گەشبین و لەخۆرازیە بەپێچەوانەی کەسایەتی رەشاوی کەدوو دڵی و خەمۆکی و گۆشەگیربوون و دوورکەوتنەوە لەخەڵک بەسەریدا زاڵە. (٧)

بێ گومان ئەم تیۆرەی ئاوێتەکان لەسەردەمی رێنیسانس دروست نەبووە، بەڵکو هەرلەسەردەمی گریکە کۆنەکانەوە زانراوبووە، بەڵام تەنیا لەبواری پزیشکیدا بەکاردەهات. هزرمەندانی رێنیسانس ئەم تیۆرەیان لەبواری کۆمەڵایەتیدا پراکتیزەکرد. شایانی باسە ئەمرۆکە ئەم تیۆرە لەبازنە زانستیەکاندا لەبەرچاو ناگیرێت، چونکە وادانراوە کەواپشت بەبنچینەیەکی

هەڵە دەبەستێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گرنگیەکی گەورەی هەبووە لەسەردەمی خۆیدا، چونکە هزرو بیری ئاراستەی کەسایەتی کرد کەکۆنەکان ئاگایان لێ نەبوو ئەویش پۆلێن کردنی کەسایەتییە لەسەر بنچینەیەکی واقیعیانە دوور لەکاریگەری ئامۆژگاری یان بانگەوازکردن بۆ نموونە بەرزەکان.

لەنیوەی سەدەی نۆزدەهەمدا کێشەی کەرەرژێنەکان دەرکەوت، ئەم تیۆرە لەشێوەی تیۆرییەکەی ئاوێنە کۆنەکەیە، بەڵام پشت بە بنچینەیەک دەبەستێت کەتوێژینەوە زانستیەکانە ئەویش جێی گومان نییە. هەر چۆنێک بێت هەندێ لەزانایان زێدەڕۆییان لەکاریگەری رژێنەکان لەپێکهێنانی کەسایەتیدا کردو پشتگیریشیان کرد. تارادەیەک کەرەرژێنەکان ناونران رژێنەکانی کەسایەتی (٨) تاوای لێهات زانایان هەردیاردەیەکی کەسایەتیان بکەوتایە بەرچاو خێرا بەزێدەبوونی دەردراوەکانی یەکێک لەکەرەلووەکان یان کەم بوونی دەردراوەدیان راڤەدەکرد. بۆ نموونە ئەگەر کەسێکی زیرەک و چالاکیان ببینی بوایە هۆیەکەیان دەدایە پاڵ زێدەبوونی دەردراوی(لووە پرە، لغدة النخامیة) کە کەوتۆتە ژێر مێشک. هەروەها ئەگەر هاتوو ئافرەتێکی رەفتار پیاوانەیان بدیبوایە کەلەجل و بەرگی یان لەکارو وازە سێکسیەکانیدا لاسایی پیاو دەکاتەوە ئەوان دەیانوت ئەوەیان دەگەرێتەوە بۆ زێدەبوونی ناواخنی رژێنی ئەدرینال کە کەوتۆتە سەرهەردوو گورچیلەکان، ئەگەر هاتوو کەسێک خێرا هەڵچووبایەو شەرانگێزبوایە ئەوا یەکسەر دەیاندایە پاڵ زێدەبوونی دەرودراوی رژێنی ئەدرینال بووە، ئەگەر هاتوو گوێ بیستی کەسێک بوونایە کە بەئاڵشت و زێدە نارەزوو خوازە یەکسەر دەیانوت ئەوەیان تووشی ئاوسانی رژێنی زاووزێ بووە، ئەگەر هاتوو پیاوێکیان بدیبایە خێرا هەڵدەچوو ئەوا ئەوەیان دەدایە پاڵ کەمی رژێنی ژێر هەوک، بەڵام رژێنی دەرەقی بەبۆچوونی ئەوان دەبێتە هۆی تەمبەڵی و خاوبوونەوەو بێ هێزی لەگەڵ چەندان بیروبۆچوونی نادروستی دیکەش. (٩)

ئەم راڤەکردنەی لایەنە جیاوازەکانی کەسایەتی لەسەر بنچینەی کەرەرژێنەکان زێدەرۆییە، کەزانایانی دەروونزانی کۆمەڵایەتی رەتی دەکەنەوە

تارادەیەک هۆکارەکانی بایەلۆجی رژێن و لایەنەکانی دیش رۆڵێکی گەورە دەبینن لەپێکهێنانی کەسایەتی مرۆڤ! بەڵام رۆڵێکی یەک لاکەرەوەنییە. لەدوای ئەوەی ئەم هۆکارە بایەلۆجیانە لەگەڵ هۆکارەکانی ژینگەی کۆمەڵایەتیدا کارلێک دەکەن و بەپێی ئەم کارلێک کردنە فرەجۆرن.

زۆرجاران دەبینین کەسێک لەپێکهاتەی بایەلۆجیەکەیدا چەندان هۆکاری بۆ ماوەیی تێدایە کەیاریدەی توورەبوون و خێرا دەستدرێژی کردنی هەیە، بەڵام لەکۆمەڵگەیەکدا لەدایک بووە کەئەم سیفەتەیان لاپەسەند نییە! لەبەرئەوە دەبینین سروشتە بایەلۆجیەکەی بەرووکارێکی دیکەدا بردووە.

جیاواز لەرووکاری دەستدرێژی و زیان پێگەیاندن کەدەشێ لەژێرکاریگەری ژینگە کۆمەڵایەتیەکەیدا ملکەچ و ترسنۆک بێت. پێی باشە کەوا خەڵک زیانی پێبگەیەنێت، بەڵام ئەوزیان بەکەس نەگەیەنێت.

هەروەها دەبێت کەسێک هەبێت خاوەن زیرەکیەکی لەرادە بەدەرێت، بەڵام لە کۆمەڵگەیەکدا دەژێت کەریزی زیرەکی ناگرێت، بەڵکو گرنگی بەکەلەش و گەورەیی  و توندو پتەوی، دەدات چونکە دەشێ ئەم کەسە تووشی سستی و بێ هێزی بێت. نە بیر لەهیچ زانستێک و نە لەهیچ فەلسەفەیەکیش بکاتەوە! بەڵکو لەخەڵک دووردەکەوێتەوەو بۆ بەختی خۆی دەگەڕێت. دەشێ یەکێک هەبێت فێداریێت یان تووشی جۆرە شێتیەکی سووک هاتبێت ئەم جۆرە کەسە لەهەندێ کۆمەڵگادا دەبێتە کەسێکی پیرۆز کەچی لەهەندێ کۆمەڵگەی دیکەدا دەخرێتە نەخۆشخانەی کەرەنتینە. (١٠)

ئێمە لێرەدا دەتوانین هۆکارە بایەلۆجیەکان وەک کەرەستەیەکی خاو سەیربکەین، بەڵام هۆکارە کۆمەڵایەتیەکان دەتوانن وەک ئەو کارخانەیە تەماشای بکەین کەلەم کەرەستە خاوانە چەندان کەلوپەل و شتومەکی لێدروست دەکەن. کەواتە کەسایەتی هەر کالایەک بەتەنیا ناکامی کەرەستەخاوەکان نییە، هەروەها ناکامی جۆری کارگەکەش نیە! بەڵکو ناکامی هەردوو هۆکارە دوای ئەوەی کەم تازۆر کارلێک دەکەن.

(مۆتران) بۆ نموونە دەڵێت: کەم بوونی دەردانی پۆرگی پێشەوەی لووە پڕە

ئەوکەسە تووشی کورتە بالآیی دەکات، تێبینی دەکرێت کەوا زۆربەی جار کورتە بالآکان هەوڵدەدەن پۆشاکیان جوان و رێک و پێک و رێک پۆش بن، بەڵام راست نییە، ئەگەر بوترێت: کەمی دەردانی لوور پڕە (الغده النخامیه) هۆکاری راستەوخۆی خۆبەزل زانین و خۆنواندنە، راست وایە بوترێت: کاریگەری ژینگەی کۆمەڵایەتی لەسەر پێکهێنانی کورتە بالآ بووەتە هۆی ئەم دیاردەیە، بەڵام گەر لەژینگەیەکی پڕ سۆزتر پەروەردەبوو بایە ئەوا جۆرە ناکارێکی دیکەی دەبوو. (١١)

هەرچۆنێک بێت، زانایان ماوەیەک لەبارەی مەسەلەی (کامیان کاریگەرترە) لەپێکهاتەی کەسایەتی مرۆڤ رای جیاوازیان هەبوو: بۆ ماوەیی یان ژینگە، یان بەدەستەولژەیەکی دیکە: هۆکارە بایۆلۆژییەکە یان هۆکارە کۆمەڵایەتیەکە. زانایان لەسەرەتادا رایان لەگەڵ دووپاتکردنەوەی هۆکارە بایۆلۆژییەکە دابوو، بەڵام ئەمڕۆ بایەخێکی زۆرتر بەهۆکارە کۆمەڵایەتیەکان دەدەن ، و کەسایەتی، وەک وتمان، بەناکامێکی کارلێک کردنی بەردەوامی نێوان هاندەرە سروشتیە بەگورەکەی کۆمەڵگەو پاشماکی بەسەریدا دەسەپێنێت.

بەرێزان وامەزانن نهێنی کەسایەتی بۆیەکجاری دۆزراوەتەوە یان زانایان بەتەواوی گەیشتونەتە نهێنی ئەو هۆکارانەی کاری تێدەکات. تا نێستا بەشێکی گەورەی کەسایەتی لێڵە.

(تیرل) لەکتێبەکەی (کەسایەتی مرۆڤ)دا دەڵێت لەقولایی دەروونی مرۆڤدا چەندان هێزی تێپەڕین و داهێنەر هەن بەردنگاری رۆڵی کات و شوێن دبنەوە ئەمڕۆ چییە تیپەکەی(ماهیەتەکەی) بەم یاسایانەی سروشت کەدۆزراونەتەوە راڤە ناکرێت.

(تیرل) دەڵێت: بڕوانە ئەم سەماکەرە بەتواناو داهێنەرەی جوولە گونجاوە یەک لەدواییەکەکان دەکات، هەر ماسولکەیەک جوولەیەکی رێک لەکاتێکی دیاریکراو دەکات بێ ئەوەی ناکۆک بێت لەگەڵ جوولەی ماسولکەکانی دیکە، بێ ئەوەی خۆی شەکەت بکات بەو رادە خۆماندووکردنەوەی کەپێویستە بۆ هاوبەشی کردن لەجولەکانی سەما کەبەشێوەیەکی چاک و داهێنەرانە، گەر

لیتی پرسی: چۆن ئەم کارە سەرسوڕهێنەرە دەکەیت لەوەڵامدا دەڵێت: نازانم، لەسەما ڕاهاتوون و دواتر ئەو هێزە نهێنییەی کەتیایەتی ڕەهای کردووە ئەم داهێنانە مەزنەی لێ کەوتۆتەوە.(١٢)

هەمان شت لەبارەی شاعیر یان داهێنەر یان پێغەمبەر یان مۆسیقاژەن یان زاناوە بڵێ، هەریەک لەوانەو کەسانی دیکەیش لەقووڵایی دەروونیان هێزی گەورە هەڵدەقوڵێت بەتەواوی بنەڕەتەکەی نازانێت. بزانێت و نەزانێت ناڕاستەی دەکات ئایا چۆن دەتوانیت سیمفۆنیەکانی (بتهۆڤن) یان تیۆرییەکانی (نیوتن) یان داهێنراوەکانی (ئەدیسۆن) یان ڕۆمانەکانی (شکسپیر). ئایا ئەم شاکارە نەمرانە لەئاکامی وردە ژمێر یان چەندان هۆکاری دیاریکراویان تەنیا بەهەوڵ و کۆششی ئەوان بوویێت.(١٣)

ئایا بۆ نموونە دەکرێ پێغەمبەرایەتی محمد بەپێی ڕاوبۆچوونی زانایانی ئەمڕۆ ڕاڤەبکرێت؟ کەلەبارەی کارلێک کردنی هۆکارەکانی پاشماکی (وراثی)و دەوروبەر (ژینگە) هەیەتی لەپێکهێنانی کەسایەتی مرۆڤدا؟

ئایا توانستی هەندێ خەوتێنراوی موگناتیسی لەدۆزینەوەی هەندێ شتی وەک چۆن ڕاڤە دەکەین. ئایا چۆن دەتوانین کاری کەسێک ڕاڤە بکەین کە لەنێوان پەنجەرەیەک و پەنجەرەیەکی دیکە دەفڕێت یان بانگی شتێک بکات و بەدەنگیەوە بچێت؟

من خۆم پیاوێکم بینی چەندان ژمارەی لێ پرسراوە بۆ کۆکردنەوەو بەیەک ترووکە ئاکامی کۆکردنەوەی هەموویان بەتەواوی دەداوە.

زۆرجاران هەوڵ دەدەین ئەم دیاردە تێپەڕێنانە (خارق) ڕاڤەبکەین بەوەی لەچەند ناوێکی دیاری کراوی لێ بنێین و پاڵ کەوین وەک ئەوەی گیروگرفتەکەمان چارەکردبێت و نهێنیەکەمان ئاشکرا کردبێت، لەبارەی دیاردەیەک لەدیاردە (بینەوەرەکان) دەڵێین: خەواندنی موگناتیسیی یان جادووە یان بلیمەتییە یان پێغەمبەرییە.... هتد لەو ناوانەی دەیانڵێین و هیچ واتایان نازانین.

بەڵێ: بەشێکی زۆری کەسایەتی مرۆڤ هێشتا نهێنیەکی لێڵە، ئێمە لەگەڵ

ئەوەی دان بەم بەشە لێنـە دادەنێین بەردەوام دەبـین لەتوێژینەوەمـان لەبارەی کەسایەتی لەو لایەنەی کە روون و ئاشکرایە لەکەسایەتیدا.

ئەم لایەنەیە دەشێ لێی بکۆڵرێتەوەو هۆکاری کاریگەرەکانی بزانرێت. ئەگەر چاوپـۆشین لەوهێـزە داهێنەرە شـاراوەیەی کـەهەندێ کـەس هەیەتی دەبـینین کەسـایەتی وەکـو وتمان کـارلێکردنێکی بەردەوامـی نێـوان هۆکـارە بـایەلۆجی و هۆکارە کۆمەلایەتیەکانە.

**خوشک و برایان:**

لێرەدا پێویستە بزانین کەوا کەسایەتی بەتەنیا سـیفەتێکی تایبەتی مرۆڤەو ئاژەڵان کەسایەتیان نییە هەروەها منداڵیش لەدایک دەبێت کەسایەتی نییە، بەڵام کەسـایەتیەکەی بەرەبەرە پەرە دەسێنێت هەرچەند لەتەمەن گەورەتر دەبێت. پێش چەند سـاڵێک یەکـێک لەزانایانی کـە لەبواری لێکۆڵینەوە لەئاژەڵان کـاردەکات کـتێبێکی بەناونیشـانی (کەسایەتی ئاژەڵ) چاپ کـرد.(٤) بێ گومـان ئەم نـاونیشـانە جۆرە هەڵەیەکی تێدایە چونکە هەروەک گـوتمان ئاژەڵ کەسـایەتی نییـە. دەشێ هەندێ لەئاژەڵانی وەک سـەگ یان ئەسپ یان مـەیموون هەندێ نیشـانەی لێ بەدەربکەوێت کەهێمـای بوونی کەسایەتی بکەن، بەڵام گەرلەم نیشـانانە بکۆڵینەوە دەبینین (وەڵامـدانەوەیەکی گـونجـێندراوە) واتە وەڵامـەکـەی پتـر لەوەڵامی ئامـێـرێکی ئاڵۆزکـاو دەچێت لەوەی وەک وەڵام دانەوەی کەسێک بێت کەهەست بەخۆی بکات.

لەراسـتیدا ئێمە کەسایەتی خۆمان لەقەبەر ئاژەڵان دەکەین لەوکاتەی کەئەم نیشـانانەیان لێ دەبینین کەهێما بۆزیرەکی یان سـۆز دەکەن واتا جووڵانەوەکانی بەهەمـان شێـواز راڤەبکەین کە جووڵانەوەکـانی خۆمانی پێ راڤەدەکەین بەم شێوەیە کەسایەتییەکی پێ دەدەین کەتیایدانییەو، ئەو لێی بێ بەرییە وەک بێ بەریبوونی گورگ لەخوێنی کوڕی یاقوب.

بەرێزان کەسایەتی تاکە سـیفەتێکی تایبەتی مرۆڤە دەشێ هەندێ ئاژەڵانی باڵا جۆرە سـەرەتایەکی کەسایەتی بنەمای پێکهێنانێکی تێدابێت، بەڵام تەنیا مرۆڤ خاوەنی ئەم تایبەتییـە دەگمەنەیە. ئەو کەسـایەتییـەی کەوای لێکردووە

ئەم هەمەرەنگیە سەرسوڕهێنەرە لەشارستانیەتەکان و داهێنانی هزری بێنێتە بەرهەم.

دکتۆر یوسف مراد لەم بارەیەوە دەڵێت:« کەسایەتی بەواتا تەواوەکەی پێویستی بەهەبوونی هەست بەخۆکردن هەیە ئەگەر گریمان هەندێ ئاژەلان توانستی هەست بەخۆکردنیان هەیە ئەوا مەرجێکی دیکە هەیە کەوا لایەنی نەبوونی کەسایەتی لەئاژەلاندا دەسەلمێنێت ئەویش نەبوونی خوازیاری ئاژەڵە بۆ هێنانەدی کەسایەتییەکەی نموونەیی لەهزرو بۆچونیدا وەک مەبەستێکی بالا . . . (١٥) شایەنی باسە لێرەدا پێویستە بوترێت کەوا کەسایەتی بەهرەیەکی سروشتی نییە، کەوا مرۆڤ لەگەڵ شتەکانی دیکە لەباب و باپیرانەوە بۆی مابێتەوە. لەراستیدا دەردەستکراوەو لەکۆمەڵگەدا پێک دێت، بەبێ کۆمەڵگە، کەسایەتی دروست نابێت ئەگەر هاتوو مرۆڤێک لەمنداڵیەوە لەنێوان ئاژەلاندا پەروەردەبوو ئەوا کەسایەتی تێدا نارسکێت و هەست بەخۆکردنی تێدا پەیدانابێت. هەروەها سەلمێنراوە کەوا کەسایەتی پێکهاتەیەکی نائارامەو بەئاسانی هەڵدەوەشێتەوەو دەکرێ دابەش بکرێت و ببێتە چەند لایەنێک. زۆر لەتوێژەران چەندان تاکەکەسیان لەنێو خەڵکدا دۆزیوەتەوە کەوا خاوەن دووکەسایەتی یان زیاترن. دکتۆر (برنس): توانی بەرێبازێک کەوا لەخەواندنی موگناتیسی دەچێت لەکچێکدا دوو کەسایەتی لەیەک جیاواز پەیدابکات، یەکێکیان دەمێک کاردەکات و دواتر ئەوی دیکە یان دەکەوێتەکار، کچەکە کەبەیەکێک لەم دوو کەسایەتیانە کاردەکات ئەوا کەسایەتیەکەی دیکەی فەرامۆش دەکات.(١٦)

دکتۆر (سارجنت) زانای دەروونزانی هاوچەرخ دەڵێت بەخۆی ئافرەتێکی دیت خاوەن دوو کەسایەتی بوو. ئەوکچە بە کەسایەتیەکی ئاسایی رۆیشت بۆ بەرێکردنی مێردەکەی لەوێستگەی شەمەندەفەر بەبێ ئەوەی دواتر هەست بەخۆی بەکات کەوا لەشارێکی دیکەدا دەژێت و بەجۆرە کەسایەتیەکی دیکەو بەبێ ئەوەی پێی بزانێت کەوا هەر خۆیەتی ئەو ئافرەتەی کەمێردەکەی لەوێستگەی شەمەندەفەر بەرێکرد.(١٧)

ئەگەر ویستمان لەم دیاردە سەیرە بگەین دیاردەی فرە کەسایەتی یان دابەش بوونی کەسایەتی پێویستە لەسەرمان پێش هەموو شتێک کەمێک لێی قووڵ بینەوە بۆ ئەوەی بگەینە ناوەندی کەسایەتی یان بنەڕەتەکانی کەلێیەوە پەیدادەبێت و پشت بەو دەبەستێت. زانایان دەڵێن ناوەندی کەسایەتی هەست بەخۆکردنە یان وەک هەندێ جار پێی دەگوترێت دەروون. ئێمە لێرەدا مەبەستمان لەدەروون ئەو واتا باوەنیە کەلەنێوان خەڵکدا لەبارەی گیانەوە هەیە. گیانەدروون نییە. زۆر لەنووسەران بەهەڵە داچوونە لە تێکەڵکردنی ئەم دووچەمکە.

بەڕێزان گیان دیاردەیەکی میتافیزیکیە یاخود بایەلۆجیە هیچی لەبارەیەوە نازانین. بەڵام دەروون ئەو هەستەیە کەوات لێدەکات بڵێی (من) یاخود هەست بەخۆت بکەی کەجیاوازی لەخودەکانی دیکەی دەوروبەرت. دەروون چییە، هەست بە (من) کردن چییە؟ دەشێ مرۆڤێکی ئاسایی سەرشەقام ئەم پرسیارە بەهیچ و پووچ بزانێت، هەست بەخۆی دەکات و دەڵێ من لەهەموو رۆژێکدا دەیان جار دەڵێ (من) تا وادەکات زۆرجاران ماندوو شەکەت بێت لەڕێی دووپاتکردنەوەی ئەم (من)ەو پەرەپێدانی و شانازی پێوەکردنی. ئەگەر لێی بپرسین چییە؟ بەسەرسوڕمانەوە سەری خۆی دەخورێنێت و یان فشەی، پێدێ بەڵام فەیلەسوفەکان چەندان سەدەیە بەبەردەوامی بەدوای ئەم (من)ە دەگەڕان چی یەو چۆن لەمرۆڤدا پەیدابووە؟

دەگێڕنەوە یەکێک لەگێلە هەرە بەناوبانگەکان کەناوی (هەنبەقە)بوو ملوانکەیەکی لە مل بوو لەنوشتەو ئێسک و لەتەسوالەی پێوەکردبوو لێیان پرسی بۆچی وادەکەی، لەوەڵامدا گوتی: بۆ ئەوەی خۆمی پێ بناسمەوە ئەوەک بزریم. شەوێکیان کەخەوتبوو برایەکەی ملوانکەکەی لێ دزوی و لەملی خۆی کرد. بەیانی کە (هەنبەقە) لەخەوهەستا تەماشای کرد ملوانکەکە لەملی برایەکەی دایەو پێی گوت برام تۆمنی. ئەی من کێم؟

(١٨) ئەم چیرۆکە لەکتێبەکانی گاڵتەو ئەدەبیاتدا دەگێڕدرێتەوە لەبارەی ئەم گێلەپیاوە دەوترێت کەشێتە یان دەبەنگە، وەک ئەوەی بڵێی گومانکردن لە

(من)دا نیشانەیەک بێت لەنیشانەکانی گێلی ئەگەر ئەوەشیان وابێ ئەوا زۆر لەفەیلەسوفەکان و زانایانی دەرونزانی و کۆمەڵزانی لەوکاتەدا دەبنە پیاوێکی گێل! فەیلەسوفەکان هەر لەسەرەتای مێژووی هزرییەوە لەدەرونیان کۆڵیوەتەوە بەڵام زۆرجار لەبنەڕەتدا هیچ جیاوازیەکیان نەبووە لەگەڵ بۆچوونی کەسانی ئاسایی بۆ دەروون. لەراستیدا یەکەم بۆمبای کەلەبارەی بابەتی دەروونەوە تەقێنرایەوە ئەو هزرەبوو کەوا (هیوم) فەیلەسوفی بەناوبانگی گومان هێناکایەوە. ئەم فەیلەسوفە هەوڵی دەدا بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کەوا دەروون وەک قەوارەیەکی سەربەخۆ بوونی نییە، بەڵکو بەبۆچوونی ئەو دەروون بریتیە لەزنجیرەیەکی یەک لەدوای یەک یەکی هزرو تاقیکردنەوە بەجۆرێک کەوا ئەم زنجیرە بەهەستکردن بەبوونی شتێک دەدات کەلەراستیدا بوونی نیە. (١٩) هەر لەسەردەمی (هیوم)ەوە هەتا ئەمڕۆ فەیلەسوفەکان بەراست و چەپدا دەگەڕێن بەدوای چیەتی دەروون، چۆن پەیدابوودو چۆن تەنیا لەمرۆڤدا نەشونما دەکات و لە ئاژەڵدا نییە. هەرچۆنێکیش بێت تازەترین رای زانستی لەبابەتی دەروونداا ئەو رایەیە کەبەهەشتی (چارلس کولی) پرۆفیسۆری کۆمەڵناسی پێشوو لەزانکۆی (میشن)ی . پوختەی ئەودی کولی دەیلێت لەم بارەیەوە:

دەروون ناوێنەی کۆمەڵگەیە یان بەدەستەواژەیەکی دیکە: دەروونی تۆ زایەڵەی ئەوبیرو بۆچوونەیە کەخەڵک لەباردی تووەوە هەیانە، هەروەها ئەو رۆڵەی کەلەژیانی کۆمەلایەتیدا پێی دەبەخشن. ئەتۆ ئەتۆکێی؟ تۆهەست بەخۆت دەکەیت و دەڵێی (من) یەک چێن لەگەڵ ئەو بیروبۆچوونەی کەخەڵک لەبارەی تۆوە هەیانە، یان چاکتر وایە بڵێین: ئەوەی تۆ هەستی پێدەکەیت کەوا بیرو بۆچوونی خەڵکە لەبارەی تۆ.

پرۆفیسۆر (دینسن) تیۆرەکەی (کولی) بەشێوەیەکی زۆرچاک خستەڕوو کەوتی: ئەگەر توانیت سروشتی وێنەیەکی دیاریکراو لەبارەی ئەوکەسە خۆی پێ ببەخشیت ئەوا دەتوانیت چەندان جۆری رەفتاری مرۆیی لەم مرۆڤەدا بێنیتە بەرهەم. نموونەی دوو مرۆڤی هێنایەوە یەکێکیان بەرێبازێک لەرێبازەکانی سروشتی ئەوەی پێی دەدەیت کەوا بەگزادەیەکی رۆمانیە ئەودی دیکەیان

بەندەیەکی رۆمانیە ئەوا ئەوکەسەی کەلەدەروونی خۆیدا بیروبۆچوونی وایە کەوا بەگزادەیەو کارو کردەوەکانی وارێک دەخات وەک بەگزادەکانی کە رۆمانیەکان دەیانکرد بەنموونە باوەڕیان وابوو کەوا ئەگەر بەندە لەفەرمایشی فەرماندەرەکەی یاخی بوو ئەوا پێویستە بکوژرێت. بەندەکەش باوەڕی وادەبێت کەوا ئەگەر هاتوو بەرەنگاری فەرماندەرەکەی بووەوە یان لەفەرمانەکانی یاخی بوو ئەوا تاوانێکی کردووەو شایانی کوشتنە کەواتە لەخۆی دەگات کەوا کەلوپەلێکە دەکردێ و دەفرۆشرێ و مولکی فەرماندەرە بەگزادەیەکەیتی.(٢٠)

یەکێک لەزانایان ئەزمونێکی کردو تیایدا سوودی لەخەواندنی موگناتیسی وەرگرت بەوکەسەی راگەیاند کەخودی ئەو یان وەک لەشیکردنەوەی دەروونزانیدا پێی دەوترێت (ئیگۆ - Ego) لە پەیکەرێکی لەکارتۆن دروستکراوی بەردەوامی ئەودایە، ئەوکەسە خەوێندراوە بەشێوەیەک لەگەڵ ئەم پەیکەرە دەجولایەوە وەک بلێی بەراستی خودی ئەو لەم پەیکەرەدا بێت دەتدیت توورە دەبێت ئەگەر پەیکەرەکە زیانی پێگەیشتبا، ئەگەر لەپەیکەرەکە بدرابا هەستی بە ئازارو ژان دەکرد، بەلام ستایش کرا بوایە بەهەڵبەستێکی رێک و پێک ئەوا کەیفخۆشی سەرتاپای دەگرت.

بەڕێزان ئەم رووداوە سەیرنیە هەریەک لەئێمە وەک ئەو پیاوە وایە، بەلام بەشێوەیەکی لەسەرخۆتر. زۆرجاران لەژیانی ئاساییاندا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەوا کەسێک یاخود شتێکی دیاریکراو بوەتە بەشێک لەئێمە وەک منداڵ یان هۆز یان زانست یان بیروباوەڕ یان ولات...هتد.

دەبینین ئەگەر یەکێک جنێو بەم شتە یان بەم کەسە بدات کەبەشێکی ئاوێتەی خودی خۆی زانیوە یەکسەر هەڵدەچێت و تورە دەبێت، دەشێ دەستیش بوەشێنێ.

شتێکی زۆر ئاساییە کەکەسێک لەنێوان خۆمان، ئێمەی ئامادەبوو ئالێرەدا ببینینەوە تەنیا بەوشەیەکی بێ گوناه هەڵبچێت و تورە ببێت تەنیا لەبەر ئەوەی ئەم وشەیە بووەتە بەشێک لەخودی ئەو بەشێوەیەک لەشێوەکان.

بەرێزان ئێمە هەموومان لەکاروباری ژیانماندا کەوتووینەتە ژێر کاریگەریەک لەشێوەی کاریگەری خەواندنی موگناتیسی، باناوی بنێین کاریگەری (خەواندنی کۆمەڵایەتی).

منداڵ کەچاو بەژیان هەڵدێنێت و بچووکە خەوێنەرە گەورەکە، واتا کۆمەڵگە، تێی دەگەیەنێت کەوا ئەو فلانی کوڕی فلانەو بەشێکی جیانەکراوەیە لەخێزان و چینێکی دیاریکراو پێویستە لەسەری واو وابکات. بەم شێوەیە پەروەردە دەبێت وەک خەوێنراوێک دەڕوانێتە خۆی وەک خەڵک لێی دەڕوانن، ئەوکارەش دەکات کەپێویستە بکرێت وەک چۆن کۆمەڵەکە تێی گەیاندووە ئەو کۆمەڵەی کەتیایدا دەژێت. ئەگەر ئێمە لەخەواندنی موگناتیسی بکۆڵینەوە بەلێکۆڵینەوەیەکی زانستیانە دەبینین لەزۆر رووەوە وەک خەواندنی کۆمەڵایەتی وایە، خەوێنەری موگناتیسی هەوڵدەدات یەکێک بنوێنێت کەپێی دەڵێن دوای ئەوەی چاوی لەخاڵێکی پێش خۆی دەبینێت بەدووبارەکردنەوە تێ دەگەیەنێت:

« تۆ دەنویت .. چاوەکانت پڕلەفرمێسکن ... پێڵوەکانت گران بوونە ... گرانتر بوون ... هیچ نابینیت ... جەستەت زیاتر سڕبووە ... پێڵوەکانت زۆر گرانتربوونە ... زۆر ... دەتەوێت بخەویت... پێڵوەکانت کەوتوونەتە سەریەک ... پێڵوەکانت بەتەواوی لێک چەسپ بوون ... زیاتر لێک چەسپ بوونە ... ناتوانیت بیانکەیتەوە هەتامن پێت دەڵێم ... تۆ ئێستا خەوتویت خەوێکی موگناتیسیانەی خۆش ... تۆ ئێستا لەخۆشی و بەختەوەری دایت... لەخەوێکی قووڵدای ... زیاتر قووڵ ... تۆ زۆر بەختەوەری ... تێربخەوە. (٢١)

بەم شێوەیە مرۆڤ بەرێبازی موگناتیسیانە دەخەوێنرێت: بەپێگوتن و سروشت و دووبارەکردنەوە، ئەگەر خەوێنەر دەتوانێت هەمووشتێکی پێ بڵێت یان فەرمانی پێبدات و ئەویش بەگوێی دەکات بەتایبەتی.

لەبارەی ئەوشتانەی کەدەکەونە دوای بەئاگاهاتنی. ئایا جیاوازی لەنێوان ئەو خەواندنە موگناتیسیەو خەواندنی کۆمەڵایەتی چییە؟!.

خـەوتێنەری مـوگناتیـسی دەتوانێت زۆر ئەزمـوونی پێکەنیناوەو لەسەرخەوتێنراودا بکات. بەنموونە دەتوانێت پێیـان بڵێت کەئەگەر بەئاگاهات دەبێت بەمەڕ پاشان بەیەکێکی دیکە رادەگەیەنێت کەبووە بەشوان و ئەرکی سەرشـانیەتی بەهێمنی لەسـەرخۆ بیـبات بیلەوەڕێنێت. ئەو کەسـانە کە بەئاگادێت واهەست دەکەن کەبەڕاستی مەڕن لەسـەر چوار پەل دەڕۆن و باعە باع دەکەن. شوانەکەش دەیانداتە پێش خۆی وەک چۆن پێی وتراوە دەیانبات بۆ لەوەڕ خۆ ئەگەر هاتوو پێی وترا بوایە بەلێدان بیانبات وادەکرد.

دەگێڕنەوە پیـاوێکی ئایینی توندگـیر جارێکیـان خەوێنراو لە کـاتی پێی راگەیەندرا کەوا ئەگەر پاش بەئاگاهانی گوێی بەلێدانی کاتژمێربوو پێویستە لەوکاتەدا لێدوانێکی توندوتیـژو لەبارەی ستـایشی کوفرو خوانەناسی بدات کەئەم پیـاوە توندگـیرە بەئاگـاهات دانیـشت و وەک باری ئاسـایی دەسـتی بە ئاخاوتن کرد، بەڵام یەکسـەر کەگوێی لەزەنگی کاتژمێربوو چوست هەستایە سەرێ و دوانێکی پڕجۆش و خرۆشی لەبارەی ستـایشی کوفرو خوانەناسی دا وەک چۆن لەکاتی خەواندنا پێی وترابوو.

دوای ئەوەی لەدوانەکەی بۆوە یەکێک لە ئامادەبووان کەئەو هەڵوێستە لێک دژەی دیت پێی وت هۆی ئەم لێک دژیەی قسـەکان چی بوو، ئەم کوڵەوارە ما بەهانەو بەڵگە بێنێتـەوە بەوەی کـەوا قـسـەکـانی لێک دژ نەبوونە ئەوەی کردوویەتی راست بوودو مەبەستی چاکەو خێرخوازی بووە. دەشێ وەک واباوە چەندان فـەرمـوودەی پێـغـەمـبـەرو چەندان ئایەتی قـورئانی هێنابێـتـەوە بۆ پشـتگیری قـسەکانی.

خوشک و برایان گاڵتـە بەوکابرایە مەکەن ئێمە هەموومان وەک ئەوین، بەڵام شێوازی خەواندنەکە جیـاوازە، وەک (لاندس) دەڵێت (٩ر٠) ئەوەی دەیکەین و ئەوەی دەڵێین و ئەوەی بیـری لێـدەکەینەوەو ئەوەی هەسـتی پێـدەکـەین هەر لەبەئاگـاهاتنەوە لەبەیانیـدا هەتا لەئێـوارەدا دەگەڕێنەوە ناو پێـخەف هەمـووی لەسـەر ئەم رێچکەیە بەدی دێت کەوا کۆمەڵگەی پێمـانی بەخشیـوە لەرێـگاو بەهاو داب و نەریت و خووڕەوشت. (٢٢)

هەموو ئەو نیشانە دەکەین بەڵام لەو باوەڕەداین کەوا لەوەی دەیکەین ئازادین بەویستی خۆمان و بە مەبەستی خۆمان دەیکەین پێش ئەوەی بیکەین بیرمان لێکردۆتەوە ... هتد لەوڕێنان.

لەراستیدا ئێمە ئەوکارانە دەکەین بەپێی ئەو سرووشەی کەوا خەوێنەری گەورە پێی داوین واتا کۆمەڵگە پاشان دوای ئەوە وەک ئەو دیندارە کۆڵەوارە بەدوای بەهانەو چەندان جۆرە رەوانیشاندان و بەباش نیشاندان دادەگەرێین بۆ ئەوەی لەبەردەم خەڵک واخۆنیشان بدەین کەوا تووشی لێک دژی لەگەڵ خۆمان نەهاتووین. (محمد) پێغەمبەر دەڵێ: خەڵک نووستوون کەمردن واگا دێن. (۲۳)

ئێمە هەتا لەژیاندایین لەکۆمەڵگەدا دەژین، بەشی هەرەزۆری بیرکردنەوەکەمان و کاروباری رۆژانەمان لەسەر بنچینەی سرووشی کۆمەڵایەتی دامەزراوە ئەو سرووشەی هەرلە رۆژانی بەرایی منداڵیماندا وەری دەگرین لەقووڵایی هۆشی ناوەوەماندا جێگیر دەبێت لەسەر ئەم رێچکەیەشدا دەڕۆین چ لێی بەئاگابین یان لێی بێ ئاگابن. تا ئەو رادەیەی کە

داب و نەریتێکمان بینی یان کارێکمان بینی جیاواز لەوەی کەلێی راهاتووین زۆر سەیر دێتە پێش چاومان یەکسەر گاڵتەی پێدەکەین و پێی پێدەکەنین وەک ئەوەی تەنیا ئێمە لەوجیهانەدا پڕ ئاگایی بین کەچی راستیەکەی لەوەدایە کەئێمە بێ ئاگاین یان وەک محەمەد (پێغەمبەر) وتی خەوتبووین لە کاتی مردن بە ئاگادێین. دەشێ هەندێ کەس بەگاڵتە کردنەوە بڵێن کێ دەزانێ لەوانەیە لەدوای مردنیش بکەوینەوە خەونێکی دیکە؟

لەپێشدا گوتمان دەروون ئاوێنەی کەسانی دیکەیە تیایداو لەسەر لاپەڕەکانیدا هەست و نەستی ئەو کۆمەڵەی دەوروبەری تێدارەنگ دەداتەوە ئەو قسەیەش مانای وانییە کەوا ئەم ئاوێنەیە روون و بێ گەردە وەک لە راستیدا ئاوێتەیەکە زۆر لەگرێ و شێوان و پێچ و پەنای تێدایە. دەشێ منداڵێک کەم ئەندامیەکی تێدابێت یان لاوازبێت و کەوتبێتە ژێردەسەڵاتی منداڵەکانی دیکەی

هاوتەمەنی تووشی گاڵتە پێکردن و زیان پێگەیاندن هاتبێت. ئاوێتەی دەروونی لەوکاتەدا پڕە لەگرێی قووڵ کەلەگەورەییدا ناتوانێت لایان ببات یان شیانبکاتەوە، دەشێ ئەم منداڵە خاوەن بەهرەو بلیمەتیەکی گەورەبێت. وای لێدەکات ببێتە کەسێکی بەناوبانگ و ڕێزلێگیراو لەنێو خەڵکدا، بەڵام ئەو گرێی خۆبەکەمزانینەی کەهەر لەمنداڵیەوە لەدەروونیدا پەیدابووە ڕێی لێدەگرێت هەست بەم پایە کۆمەڵایەتیەی لەگەورەییدا پێی گەیشتووە بکات لەبەرئەوە هەرخۆی بەکەم دەزانێت و خۆی بەجێی گاڵتە پێکردن و بەکەمزانی دەزانێت.

(باستۆر) بۆ نموونە کەمێک دڵەنگی و لاوازبوو دەشێ هەر لەمنداڵیەوە هەستی بەکەمی کردبێت لەدەروونیدا دوای دۆزینەوەی مێکرۆب و بڵاوبوونەوەی. ناوی لەسەرجەم جیهاندا بڵاو بۆوە کەچی ئەو هەر هەستی بەکەم و کورتی خۆی دەکردو تائەو رادەیەی کەجارێکیان چوونە کۆبوونەیەکی گەورەی ڕێزلێنان لەوکۆبوونەوەیەدا کەلەدەرگا چوونە ژوورەوە سەرجەم خەڵکەکە دەستیان بەچەپڵە لێدان کرد. ئەویش ئاوڕی لەبرادەرەکەی خۆی دایەوەو وتی: ئەوەچی بوو ئایا دەبێ پاشا هاتبێتە ژوورەوە؟ لەبەرئەوەی لای وابوو ئەوچەپڵە لێدانە بۆ هاتنەژوورەوەی پاشایە سەیر لەوەدایە کەهەندێ ئەگەر گوێی لێ بێ چەپڵە بۆ پاشا لێدەدرێت و وادەزانێ بۆ ئەو لێدەدرێت، شێتیش چەندان جۆری هەیە وەک دەزانین.

بینیمان گرنگترین هۆکارەکانی پێکهێنانی کەسایەتی ئەو کۆمەڵە بەراییە یەکە وا منداڵەکەی تێدادەژی. مەبەستم لەکۆمەڵەی بەرایی ئەو کۆمەڵەیە کەلەئەندامانی خێزان و هاوسێکان و هاوڕێانی منداڵیی و هاوتەمەنانی خوێندنگەیە. ئەم کۆمەڵەیەیە کەوا کەسایەتی منداڵ دا دەڕێژێت لەقالبێکدا کەدواتر گۆڕینی زەحمەتە.

منداڵ کەچاوی بۆ ژیان دەکاتەوە دەبینێت پایەیەکی دراوەتێ، بەرز یان نزم. لەلایەن ئەو کەسانەی کە لەدەوروبەریدان.

ئەوانە بڕیارێکی لەسەردەدەن باش یان خراپ ئەوبڕیارەش دووبارە دەکەنەوە،

منداڵەکە واڵەهزریدا دەچەسپێت کە دیارە وەک ئەو وەسفەوایە کەکۆمەڵەی دەوروبەری لە بارەی ئەوەوە دەیڵێت: بەم شێوەیە کەسایەتی منداڵ لەسەر ئەم خاڵە ناوەندەیەوە گەشەدەکات: خاڵی ناوەندیی دەروون یان کاکڵی دەسپێکی پێکهاتنی دەروون.

بادوو نموونەی بەرچاو لەسەر ئەم بۆچوونە بێنینەوە کەلەزۆر لەو کەسایەتیانەی کەهەموو رۆژێک دەیانبینیندا هەیە: ئەم منداڵە کەلەخێزانێکی دەوڵەمەندو بەناوبانگ گەورەبووەو بەژن و باڵایەکی جوان و رووبەکی گەشی هەیە سەرەڕای جلوبەرگێکی جوان و پاک و تەمیز دەبینین ئەم منداڵە لەنێو هاوتەمەنەکانیدا جێی رێزو ستایشە، هەروەها لەنێو هاوسێکانیدا سەرەڕای خۆشەویستی دایک و باوکی و نازهەڵگرتنی، چی بڵێت بەگوێی دەکەن، دەنگی بڵندە، برادەرو یارمەتی دەری زۆرە ئەگەر یەکێک ناکۆکیەکی لەگەڵ هەبێت ئەوا خەڵک بەکۆمەڵ دێن یارمەتی دەدەن و پشتگیری دەکەن. جا ئەگەر زۆرداربێ یان زۆرلێکراو لەم پەروەردەیەدا بڕوا بەخۆ دەبێت و هەرچی دەیڵێت وادەزانێت کەوا قسەکەی تەواوەو راستی هەر لەقسەکەی ئەودایە چونکە وارا هاتووە کەهەموو ئەوەی دەیڵێت خەڵکی دەوروبەری لێی رازین جا چ راست بێت یان هەڵە.

کەسایەتی ئەم منداڵە لەزۆربەی جاران کراوەیەو گەش بینەو رووسافە. پێویستی بەبانگەوازکردن بۆ تێکۆشان یان ماندووبوونی بەردەوام نییە. بەپێچەوانەی ئەم کەسایەتیەش کەسایەتی رووناشرینین ماندوو کەلەماڵێکی هەژار پەروەردە دەبێت دەبینین چەوساوەیەو پێ راناگات قسەیەک بکات هەتا دەبینین کەسانی دەوروبەری لێی بێزارن و نارەزایی بەرامبەر دەردەبڕن.

ئەم جۆرە کەسایەتیە گۆشەگیر دەبێت و لەرێگایەکی دیکەوە جگە لەرێگای برادەران و هاوتەمەنەکانیدا بەدوای ناوبانگ دەگەڕێت، لەم جۆرە کەسانەدا بلیمەتان هەڵدەکەون لەهەمان کاتدا دەشێ تاوانباران یان ترسنۆکەکان یان خاوەن رکو کینە و گێلی و تەتەڵەزمان هەڵکەوت.

دەشێ ئەم منداڵە چەوساوەیە رووبەڕووی دووجۆر رێزلێنان ببێتەوە لەیەکەم

کۆمەڵەدا دەشێ لەباوک و دایکیەوە سۆزو ڕێزێکی زۆری لێ بگیرێت کەچی لەبرادەرەکانیەوە بەکەمزانی و ڕک لێبوونەوە بەم شێوەیە لەدەروونیان ململانێیەکی قووڵ بەرپادەبێت هەندێ جار، ئەگەر هاتوو بەهرەمەندبوو و زیرەک و پەندیاربوو، دەبێتە هۆی گەیشتنە پلەی بلیمەتی و سەری ڕێزی بۆ دادەنوێنن. هەندێ توێژەر تێبینی ئەوەیان کردوە کەوا تاوانباران لە هەندێ وڵاتدا زۆربەیان رووناشرین یان کەم و کورتیان هەیە لەم تێبینیانەوە گەیشتنە رایەک بەوەی کەوا رووناشرین بەسروشتی خۆی روولەتاوان دەکات چونکە بەپێی بۆچوونی ئەوان پاشەکشەیەکی بایەلۆجیەو بەرەو سروشتی ئاژەڵی یەکەم دەگەڕێتەوە.

ئەم ئەنجام گیریە لەبنچینەدا هەڵەیە، تاوان سیفەتێکی دەردەستکراوە، لەزۆربەی جاران هۆیەکەی کۆمەڵایەتیە. رووناشرین بەسروشت تاوانبار نیە وەک هەندێ لەدەوڵەمەندان وادەڵێن بەڵکو کۆمەڵگە هەر لەمنداڵیەوە بەسیفەتی تاوانبار ناوزەدی کردووە لەبەر رووناشرینیەکەی، وەک تاوانبارێک پەروەردەبووە، واتە کۆمەڵگە رکی لەم منداڵە رووناشرینەبووەوەو بریاری گرتنی دا بە کەمترین هۆ و بەتوندی لەگەڵی جوڵاوەو زۆرداری لێکردو زیانی پێگەیاند بەم شێوەیە ناچاربووە روولەتاوان بکات و لەسەر ئەم رێگایە بڕوات، بیەوێت یان نەیەوێت. ئەگەر تاوانێک رووبدات و لەکاتی روودانیدا دووکەس لەوێ بوون یەکێکیان جوان و ئەوی دیکەیان ناشرین ئەوا پۆلیس یەکسەر بەخێرایی روولەگرتنی ناشرینەکە دەکات نەک جوانەکە هەتا گەر هەردووکیانی هێنایە بەردەم دادگاو دادوەر دەبینین زیاتر بەردو تاوانبارکردنی ناشرینەکە دەچێت و بەردانی جوانەکە، ئەگەرهاتوو ناشرینەکە تاوانبارکراو چووە بەندیخانە ئا لەوێدا شارەزای هونەرەکانی تاوان دەبێت کەلەهاوەڵەکانی بەندیخانە فێریان دەبێت. بەم شێوەیە لەبەندیخانەدا دەبێتە مامۆستا لە تاوانکردندا یاخود بڕوانامەی دکتۆرای تێدا وەردەگرێت هەتا ئەگەر ویستی پەشیمانیش بێتەوە خەڵک ئەم پەشیمانیەی لێ قبوڵ ناکات. خەڵک داوای بڕوانامەی رەفتارچاکی لێدەکەن کەلەکارێکدا وەری بگرن کەواتە ئەوکەسە

ناچارە ببێتەتاوانبار و کۆمەڵگە مۆری تاوانی بەنێوچەوانیەوە ناوە. بیرو بۆچوونی لەبارەی خۆی هەمان بیروبۆچوونی کۆمەڵگەیە سەبارەت بەو. لەبەر ئەوە دەبینین لەوکەسانە دەگەڕێت کەهاو چارەنووسی ئەون بەگرووپێک ڕێکخراوێک پێک دێن. کاری تاوانکردن، لەکەش و هەوای ئەم گروپەدا تاوانبار دیسانەوە خۆی دەدۆزێتەوەو تیایدا دووبارە خۆی دروست دەکاتەوەو بەشێوەیەکی نوێ خاوەن سەرفرازی و پلەو پایە لەو کۆمەڵگە بچووکەی ئەم گروپە. لەبەر ئەوەی سەرفرازی لەنێو کۆمەڵگە گەورەکەدا نەبوو بەم شێوەیە کۆمەڵگە بکوژی خۆی دروست دەکات!

ئەوەشیان هەمان شتەکە لەنێوان ڕەش پێستەکانی کۆمەڵگەی ئەمەریکی ڕوودەدات، ئامارەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەوا تاوان لەنێوان ڕەش پێستەکاندا یەکجارزۆرترە لەوەی لەنێوان سپی پێستەکاندا هەیە ئەوەشیان مانای وانیە کەوا ڕەش پێت بەسروشتی خۆی بەرەو تاوان دەچێت لەراستیدا ڕەش پێست لەبەرئەوە بەرەو تاوان دەچێت چونکە کۆمەڵگە ڕکی لێ هەڵگرتووەو بەکەمی دەزانێت، خێرا سزای دەدات و دەیخاتە بەندیخانەوە لەبەر هۆیەکی کەم و هیچ و پوچ.

کەواتا بەندیخانەی ئەو جێی خەوش نییە پاش ئەوەی لێی ڕاهاتو زۆرجاران هاتوو چۆی بۆکرد ئەوا ئەوکەسە بەرەوتاوان دەبردرێت و پاڵدەنرێت بۆ تاوان تەنیا لەبەرئەوەی ڕەش پێستە یان لووت پانە یان لێو ئەستورە هەمان شێوەش لەبارەی هەژاریەوە بڵێ.

بێ گومان هەژاری خۆی لەخۆیدا گەورەترین هۆکاری تاوانە، بەڵام بێ هێزی هەژار بەرامبەر دەوڵەمەندو کەمی پشتگیری کاری لەفەرمانگە حکومیەکان هۆکارێکی دیکەیە کە خێرا بەرەو بەندیخانەی دەبات و مۆری تاوانی لێدەدات هەر ئەوەندەیە هەژارێک سوچێکی سادەی هەبێت دەبینین حکومەت هەمووی دەهەژێت و بانگەوازی پاراستنی ئەمن و ئاسایش دەکات کەچی بەپێچەوانەوە ئەگەر دەوڵەمەندێک تاوانێکی گەورەش بکات چاوی لێدەپۆشێت و خۆی لێ بێدەنگ ددکات و دەشێ دەوڵەمەندەکە بەسەر بەرزییەوە بەرەڵلا بکرێت و

بچێتەوە ماڵی خۆی کەچی هەژارەکە فڕێ دەدرێتە تاریکستانی بەندیخانەکان. دەوڵەمەند دەڵێ هەژار بۆیە هەژارە چونکە شەڕخوازەو خراپەکارە کەچی لەراستیدا ئەم دەوڵەمەندە نازانێت لەبەرئەوەی هەژارە بووەتە خراپەکار.

خوشکان برایان:

هەرچۆنێک بێت دەتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین دەروونی مرۆڤ ئەو کەسایەتیەش لەدەوری پێک دێت، دروستکردنی کۆمەڵە یان وێنەیەکە رەنگدانەوەی ئەو کۆمەڵەیە. لێرەدا دەشێ یەکێک بپرسێت ئەگەرهاتوو دەروون دروستکردەی کۆمەڵ بێت ئایا لەبەرچی مرۆڤ فرە دەروونی نەبێت: بەپێی ئەو فرە کۆمەڵیەی کەلەکۆمەڵگەکەیدایە؟ ئەم پرسیارە راستیەکەی ئەودیەو دەمانگەیەنێتە بابەتێکی زۆر گرنگ.

(ولیم جیمس) دەڵێت مرۆڤی ئاسایی چەندان دەروونی هەیە نەک یەک دەروون. (٢٤) تۆ کەدەگەیتە کۆمەڵێک لە بەرامبەر ئەو کۆمەڵەیەدا جۆرە دەروونێکت نواندووە کەجیاوازە لەو حاڵەتەی کەبەرامبەر کۆمەڵەیەکی دیکەدا دەینوێنیت.

ئەوەی پێکەنیناوەرە دەبینین مرۆڤ کەجل و بەرگێک دادەکەنێت بۆ ئەودی جلوبەرگێکی دیکە لەبەر بکات بەتایبەتی ئەگەر بیەوێ لە ئاهەنگێک یان لەنێو کۆمەڵەیەکی دیاریکراودا ئامادەبێت. دەبینین لەگەڵ لەبەرکردنی جلوبەرگەکە خراوەتە دەروونێکی دیکە شەوە کەلەئاهەنگەدا ئامادە دەبێت دەبینیت جوڵانەوەو ئاخاوتنی بەچەشنێکە جیاواز لەو چەشنەی کەپێش دەمێک لەنێو کۆمەڵەیەکی دیکەدا هەیبوو. دەبینین سەنگین و نیشتمانپەروەرو دڵسۆزە، دژی هەموو شتێکە کەزیان بە نیشتمان بگەیەنێت، شۆڕشگێڕێکە دژی ئەو کەسانەی گاڵتە بەمافی وڵات دەکەن. کەچی پێش دەمێک کەسێک بووە جیاواز بووە لەوەی کەئێستا دەیبینیت.

گاڵتە بەنیشتمان و ئەوەی لەنیشتماندا هەیە دەکات. زۆرجاران هەرلەنێو برادەرەکانمان دەبینین کەسانێک هەن لەهەموو جووڵەو رەفتارێکیاندا هەرکە ئافرەتێک یان کۆمەڵە ئافرەتێک لەنزیک خۆیانەوە دەبینن راستەوخۆ بەتەواوی دەگۆڕێن.

دەتوانین بڵێین لەوکاتەدا هەتا لۆجیک و شێوازی بیرکردنەوەشیان دەگۆڕێت، دەشێ دوژمنی ئافرەت بێ کەلێیانەوە دووربێت، بەڵام لەنزیک ئەواندا گەورەترین بەرگریکارو بانگەوازدەری پێدانی مافەکانی ئافرەتەو بەبێ کەم و کورتی. خەڵکانێکی زۆر دەبینین لەقسەو رەفتاردا لێک دژە بەڵام لەو لێکدژیانە ناگەن ئەگەر لێیان بکۆڵینەوە دەبینین جۆرە قسەیەکیان لەبەر ئەوەیە کەوا دەروونێکی دیارکراو یان لەنێوان چەندان دەروونداهاتۆتە دوان، ئەگەر هاتوو چوونە سەر دەروونێکی دیکە دەبینیت ئاخاوتنەکەیان زۆر جیاوازەو لێک دژە لەگەڵ ئاخاوتنی یەکەمیان و بەبێ ئەوەی هەست پێبکەن.

بێ گومان هەریەک لەئێمە هەست دەکات کەوا لەخۆیدا لەرێبازی بیرکردوەیدا گۆڕانێکی گەورە روودەدات کەبەیانیان لەماڵەوە دەچێتە سەرکار. ئێوارەش لەماڵەوە دەچێتە یانە یان چایخانەکان لەماڵەوە کەسێکی دیکەیە جیاوازە لەوکەسەی لەفەرمانگەدایەو جیاوازیشە لەوکەسەی کەلەچایخانەدایە، لەسەر ئەم رێچکەیەش دەڕوات و بەبێ ئەوەی هەست بەو نەسازییە بکات کەدەشێ خاوەن مردوو بێنێتە پێکەنین.

مرۆڤی ئاسایی ئەم گۆڕان و نەسازیە بەشتێکی سەیر نازانێت لەخۆیدا، بەڵام ئەگەر شتێکی وای لەکەسانی دیکە کەوتە بەرچاو ئەوا زۆرلای سەیرو سەمەرەیە.

زۆر پێی سەیردێت گەر بۆ نموونە گوێی لێ بێت کەوا مۆسۆلینی ئەو دکتاتۆرەی کەئیتاڵیای بەئاگرو ئاسن هەڵدەسوڕاند، لەماڵەوە بچوکترین منداڵەکانی ئاراستەی دەکرد، بەدەستێکی لەقوڕو هەویر! هەروەها مرۆڤ پێی سەیر دەبێت گەر گوێبیستی بێت کەوا دکتاتۆرێک لەدکتاتۆرەکانی مێژوو لەماڵەوەدا نەرم و شلە بەدەستی خێزانەکەی و چۆنی بوێت و وەک منداڵ یاری پێدەکات.

کەواتە مرۆڤ وانییە وەک بیرمەندە کۆنەکان بۆی دەچوون: ئاژەڵێکی ئاوەزداربێت و هەمیشە لەبەر رۆشنایی لۆجیک بڕوات، و بەپێی ئامانجەکانی بیرکردنەوەی راست و رەوان.

(ملنر) مامۆستای کۆمەڵزانی لەزانکۆی کۆلۆمبیا، دەڵێت: بیرکردنەوە ئاخاوتنێکی بێ دەنگە لەنێوان مرۆڤ و کەسێکی دیکەدا کەبەئەندێشە لەپێشەخۆی دادەنێت.

ئەو مرۆڤەی کەهەرکەسێک لەبیرکردنەوەیدا لەگەڵی دەئاخاوێت دەشێ ئەو کۆمەڵە بنوێنێت کەمرۆڤ تێیدایە، یان بە دەستەواژەیەکی دیکە: ئەو دەروونە دەنوێنێت کەمرۆڤ کێشەی ئەو لەبەردەکات لەبیرکردنەوەدا. تۆ ناتوانیت هیچ بنوسیت یان بدوێیت مەگەر بەئەندێشەو بیر کەبوونی کەسێکی راستەقینە یان ئەندێشەیی نەکەیت کەلەبەردەمتدا وەستاوەو ئەوەی بیری لێ دەکەیتەوە بەچاک دەزانێت یان بەخراپ. تۆ لەبارەی هەندێ لەو بیرانەی کەبەهزرت دادێن دەڵێت دروستن یان ناوەز بەندنین، بەڵگەش بۆ ئەوە ئەم چاودێرەیە کەکۆمەڵ دەنوێنێت یان دەروونە کەهەستی کۆمەڵ دەنوێنێت.

کەواتە دەتوانین ئەنجامگری ئەوە بکەین کەوا لۆجیکی مرۆیی رەهاو گشتی نییە، بەڵکو رێژەییەو، هەموو کۆمەڵەیەک لۆژیکێکی خۆی هەیە کەلێی راهاتووە، کەواتە تۆ بەپێی ئەو لۆجیکەی کەکۆمەڵەکەت لەسەری راهاتووە بیردەکەیتەوە.

کەواتە نەسازی لەبیرکردنەوەی مرۆڤدا وەک فرە دەروونی شتێکە نیکار ناکرێت یاخود شتێکە زۆرجاران ناچارەکییە. پێوەرەکانی بیرکردنەوەو یاساکانی، لەراستیدا لەزاراوەکانی کۆمەڵگە وەردەگیرێت و لەسەر بنچینەکانی بەها و داب و نەریتەکان بنیات دەنرێن.

زۆر زەحمەتە بتوانیت کەسێک بەرایەک رازی بکەیت کەدژی ئەو زاراوە کۆمەلایەتیانە بێت کەلەسەریان راهاتووە. بروانە پیاوێک لەنێو کۆمەڵەیەکی پارێزگار پەروەردە بووبێت کەباوەڕی وابێت توند دەستگرتن بەحیجاب بەڵگەی داوێن پاکی ئافرەت و سەرفرازیەتی و، لەناخی دەروونیدا ریسایەکی لۆجیکی چەسپاوە، گومان هەڵناگرێت، کەدەڵێ: ئەو ئافرەتەی بەتوندی دەست بە حجاب نەگرێت بێ نابرووەو سەرفرازنییە لەخێزانەکەیدا، هەرچەند هەوڵ بدەن ئەم پیاوە رازی بکەیت کەوا هیچ پەیوەندییەکی لۆجیکی لەنێوان پاکیزەگی و

حجاب دا نیه ئەوەی ئینکار دەکات و تۆمەتی خۆبەزلزانی و وشکە بیرکردنەوەو یان لاوازی ئاکارت دەداتە پاڵ. هۆشپەسندبوون و کاروباری دیکە لەسەر بنچینەی ئەو رێسایانەی کەلەکۆمەڵگەکەی وەریگرتوون دەپێوڕێت، بەبێژیاری لۆجیکی کەدێنیتەوە بۆ ئەوەی ئەم پیاوە رازی بکەیت بەراو بۆچوونێکی جیاواز لەوەی لەسەری راهاتووە ناتوانیت لەم کارەتدا سەرکەویت. دەشێ لەڕووی ئەدەبییەوە بەڕایەکەت رازی بێت یان لەترسان، بەڵام هەر لەسەر ڕای کۆنی خۆی دەمێنێتەوەو لێی لانادات تا ئەوکاتەی ئەو رێسایانەی کەلەقووڵایی دەروونی دایە دەگۆڕێت. ئەوەشیان تەنیا لەرێگای پەیوەندی کردنی ئەم پیاوە بەکۆمەڵەیەکی دیکەوە دێتەدی و لەوکاتەی بتوانێت دەروونێکی نوێی دیکە بۆ خۆی وەدەست بێنێت کەوا هەست و ئەستی دەربڕێت و گۆڕانی ئەو بڵێت. بەڕێزان ئاوەزی مرۆڤ، وەک ئامێری رادیۆ وایە تۆ ناتوانیت گوێی لەئیستگەیەک بێت مەگەر کلیلی رادیۆکە بەرەو ئەو پیلە بگۆڕیت کە ئیستگەکەی لەسەرە. وەک دەشزانن کلیلی سوڕاندن، کورت یان درێژکردنی ئەو تێلە تایبەتەیە کەوەرگری پیلەکانە تاوەکو لەفرەیی بێ تەلیدا ئەوەندەی تێلی ئیستگە نێرەرەکەی لێ دێت.

ئاوەزی مرۆڤیش بەتەواوی لەسەر ئەم رایەڵە (منوال)ە کاردەکات، مرۆڤ ئەگوێ لەگفتوگۆیەک دەگرێت و ئەلێی تێدەگات و ئەپێی رازی دەبێت مەگەر ئەم گەنگەشەیە لەسەرهەمان رێسای لۆجیکی دامەزرابن کەلەقووڵایی دەروونیدا رۆچوونە. پیاوانی ئایین زۆرجاران دەیانبینیت دەکەونە گەنگەشە هەر تیمێکیان دەیەوێت ئەوانی دیکە رازی بکات کەوا تەنیا تیمەکەی ئەو تیمە سەرکەوتووەکەیە لەنێوان گشت تیمەکانی دیکەدا.

هەزاران ساڵ بەسەر ئەم گفتوگۆیە بەسەرچوو بەبێ هوودە. ئەوەی نازانن کەواچی باشە لەبەرچاو تیمێک لەتیمەکاندا دەشێ چاک نەبێت لەدیدی ئەوەی دیکەو، هەر کۆمەڵەیەک شێوازێکی تایبەتی هەیە لەبیرکردنەوە کەدەشێ ئەو بەڵگە هێنانەوەی بەدڵ نەبێت کەکۆمەڵگەکەی دیکە دەیهێنێتەوە.

زۆرجاران خەڵک دەکەونە جەنگەوە لەگەڵ یەک. و دەستدرێژی دەکەنە سەریەک و، بە ویژدانێکی ئاسوودەشەوە وەک ئەوەی ئەو زۆردارییەی بەرامبەر کەسانی دیکەدا کردوویانە جیهادێک بووبێت لەرێگەی خودا یان پشتگیرییەکی لایەنی راستی بووبێت... وەک بانگەشەی بۆ دەکەن. زۆرجاران کەسانێک دەبینین کەوازۆر زیان بەکەسانی دیکە دەدات خوێن رێژەو دەستدرێژی دەکاتە سەرخەڵک، بێ ئەوەی لەزۆرجاران دا هەست بەلۆمەی ویژدان بکات، کەچی لەهەندێ جاری دیکە هەست بەئازارو ناارامی دەکات و جێی پێجێنیە گەرینی سەگێک ئازار دەکێشێ یان نەخۆشێک دەناڵێنێت. ویژدان، بەو واتایە، وەک هۆشێ وایە دروست کردەی کۆمەڵگەیەو ئاکامی سروشت و تێفروسمانی ئەوە. مرۆی چاک و بەبەزەیی لەکۆمەڵەکەیدا دەشێ زۆردارترین کەس و دەستدرێژکەرترین کەس بێت دژی کۆمەڵەیەکی دیکە.

**خوشکان برایان:**

تائێرەو لەتوێژینەوەی کەسایەتی مرۆیی بەگشتی دەبینەوە. لەوەوە دەگەینە ئەم ئەنجامگیرییە کەوا کەسایەتی مرۆڤ، کەخاوەن دەروون و هۆشی و ویژدان و شتی دیکەشە، بەزۆری دروست کردەیەکە لەدروستکراوەکانی ئەو کۆمەڵگەیەی کەتیایدا پەیدا دەبێت.

دەتوانین بڵێین کەسایەتی وێنەی بچووک کراوەی کۆمەڵگەیە، یان وەک (دوسن ) و (کینز) وتیان، نوێنەری شارستانیەتیەکە تێیدا پەیدا دەبێت. (٢٦)

لەبەر ئەم هۆیە دەبینین کەوا ئەو کەسانەی کەلە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا پەروەردە دەبن لەهەندێ تایبەتمەندی وەک یەکن کەجیایان دەکاتەوە لەرۆڵەی کۆمەڵگەکانی دیکە.

هەرچەند تاکەکانی هەر کۆمەڵگەیەک لەنێویەکدا جیاوازن، بەڵام دەبینین لەسیفەتێکی گشتی هاوبەشن و وایان لێدەکات کە لەکۆمەڵانی دیکە جیاوازبن بەچەندان جیاوازی کەسیی بەرچاو، بیرمەندان لەکۆنەوە ئاگایان لەم جیاوازییە بووە. (٢٧)

هەرچەند لەهەمان کۆمەڵگەدا پێگەیشتبن. هەر ئەم دیاردەیەشە وای کردووە هەندێ توێژەر وەک (ئەلبورت) و (سترن)، سیفەتی شەرانگێزی (PecaLiarity) لەکەسایەتی بنێت، یان ئەو سیفەتەی کە کەسی دیکەی لەگەڵ هاوبەش نییە.

(مید) مامۆستای پێشووی فەلسەفەدە لەزانکۆی شیکاگۆ، دەڵێت هەر مرۆڤێک دوو دەروونی هەیە لەململانێ دان، دوو بێژەی (me)(نی من)و (I) (من) ی بۆ بەکاردێنێت، یان بەدەستەواژەیەکی دیکە: دەروونی کۆمەڵایەتی و دەروونی سروشتی (٢٩) کەواتە هەموو مرۆڤێک دەیەوێت، لەلایەک ملکەچی رێساکانی کۆمەڵگەبێت، لەلایەکی دیکە، دەیەوێت، شۆڕشی بەسەردا بکات. کەواتە مرۆڤ بەسروشت کۆمەڵایەتی نییە وەک ئەرستۆ وتوویەتی. بەڵکو لەراستیدا، کۆمەڵایەتی و ناکۆمەڵایەتییە بەیەکەوە. لەکەسایەتیەکەیدا توخمی ملکەچی و توخمی شۆڕش بەیەکەوە هەیە، بەدەروونێکی ملکەچی رێساکانی کۆمەڵگەی دەبێت و، بەدەروونەکەی دیکە لێی یاخی دەبێت .(٣٠) ئێمە ئێستا کەروولە لێکۆڵینەوە لەکەسایەتی تاکی عێراقی دەکەین، هەوڵ دەدەین تایبەتمەندییەکان و هەڵواردەکان دیاریکەین. مەبەستمان ئەوەنییە هەموو تاکێک لە عێراقدا (بەناچارەکی ئەوتایبەتمەندییە گشتییەی تێدایە. لەبەر ئەوەی لەورێساباوانەی زۆر لە تاکە کەسان هەوڵی دەدەن لەکۆمەڵگەکەیان لەسەری راهاتوون، یاخی بن.

زۆرجاران کەسانێک دەبینین بەپێچەوانەی ئەوەی زۆربەی هاووڵاتیان لەسەری پەروەردەبوونە رەفتار دەکەن.

ئەوەی ئێمە ئێستا هەوڵ دەدەین لێیبکۆڵینەوە ئەوەیە کەوا کۆمەڵگەی عێراقی چەندان تایبەتمەندی هەیە وادەکات چەشنێکی تایبەتی لەکەسایەتی لەزۆر ئەندامانی بەرهەم بێنێت. کەواتە، بایەخێکی زۆر نادەین بەو ڕیزبەڕانەی لەهەندێ تاکە کەساندا بەدەردەکەون ئەوانەی هەوڵ دەدەن سازش، یان لەوەی زۆربەی دەوروبەریان لەسەری راهاتوون سازش بکەن یان وازبێنن.

خوشکان برایان:

کۆمەڵگەی عێراقی، وەک هەر کۆمەڵگەیەکی دیکە هەندێ تایبەتمەندی هەیە لەوانی دیکەی هەڵداوێرێ و ئەویش کارلە پێکهاتەی کەسایەتی تاکە کەسانی ئەم کۆمەڵگەیە دەکەن.

گەورەترین دژواری کەرووبەرووی بوومەوە لە ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیەدا دۆزینەوەی ئەم تایبەتمەندییە کۆمەلایەتیانەبوو و چۆنیەتی کاریگەریان لەسەر پێکهاتەی کەسایەتی عێراقیدا.

بەڵێ دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر گەیشتمە هەندێ ئاکام، بەلام دان بەوەدا دەنێم، لەگەڵ ئەوەشدا، بەتەواوی دڵنیا نیم لەدروستی ئەم ئاکامانە، ئەوپەڕی هیوام ئەوەیە ئەم وشەیە هاندەرێک بێت بۆ کەسانی دیکە لەتوێژەران بەردەوام بن لە بەدواداچوونی ئەم توێژینەوەیە کەدەشێ بگەنە ئاکامی یەکلاکەرەوە، تیایداو بەوەش دەکرێ پەردە لەسەر نهێنیەک لەنهێنییەکانی کۆمەڵگەکەمان لابیرێت ئەو کۆمەڵگەیەی لەبەر باری گرانی و گیروگرفتەکانی شەکەتی دەروونیە. ئێمە ئەمرۆ لەم قۆناغە دژوارەدا کەپێیدا دەڕۆین پێویستە لەسەرمان دەروونذۆزی (نەفسیەت)ی گەلی عێراقی تێبگەین و بزانین کەسایەتی تاکی عێراقی تیایدا چۆن دروست دەبێت ئەویش بۆ ئەوەی: یەکەم بزانین چۆن ئاراستەی دەکەین و دووەمیش چۆن لەبوارەکانی ژیانی نوێدا ئاراستەی دەکەین. لەراستیدا من بەچاکی نازانم چاوپۆشی لەخەوشەکانمان بکەین یان هەوڵ دەین بەچاکەکەی خۆمان بنازین. هەر نەتەوەیەک خەوشی خۆی هەیە هیچ تاکەکەسێک یان نەتەوەیەک نییە گەیشتبێتە پلەی تەواویی لەهەموو شتێکدا.

لەم قۆناغە ناسکەی مێژوومانداو اباشە زەین بدەینە خەوشەکانمان و نەخۆشییەکانمان بۆ ئەوەی بتوانین چاکیان بکەینەوە لەبری ئەوەی خۆمان بەباسکردنی لایەنە چاکەکانمان خەریک بکەین لەبەرئەوەی هیچ سوودی لێ نابینین جگە لەخۆبەگەورە گرتنێکی خراپ نەبێت.

دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر تێبینی ئەوەم کرد کەوا کەسایەتی تاکی عێراقی جۆرە دووفاقییەکی تێدایە، من هەرچەندە وەک لەپێشوودا وتم، لەئاکامی ئەم

لێکۆڵینەوەیە دڵنیا نیم، بەڵام من زۆر هاوبەڵگەم لەبەردەستدایە پشتگیریم دەکات لەوەی کەبۆی دەچم. دەشێ هەندێکتان لەم قسەیە سەرسام بن لەبەرئەوەی ئەم دووفاقیەی کە دەیدەمە پاڵیان لەبەرچاویان نییە. لەراستیدا زۆر لەئێمە ئەم دووفاقیە کەسییەی کەم تازۆر لەبەردەستدایە، بەڵام ئێمە تیایدا ژیاین، و لەسەری راهاتبووین تاوای لێهاتووە بوەتە شتێکی ئاسایی لامان و وەک شتێکی سروشتی لێهاتووەو هیچ خەوشی تێدانییە.

من نکوولی لەوەناکەم کەوا دووفاقی کەسایەتی دیاردەیەکی گشتی یەو بەسووکی لەهەموو مرۆڤێکدا هەیە، لەهەر شوێنێک مرۆڤی لێبێت، بەڵام لێرەدا دووپاتی دەکەمەوە کەوا دووفاقی لەئێمەدا چڕو خەست بۆتەوەو رووچۆتە قووڵایی دەروونمانەوە.

مرۆی عێراقی، زیاتر لەکەسانی دیکە ئاشقی نموونە باڵاکانەو لەئاخاوتن و نووسینەکانیدا زیاتر بانگەشەی بۆ دەدات، بەڵام لەهەمان کاتیشدا لەهەموو خەڵک زیاتر لەژیانی رۆژانەیدا لەم نموونانە لادەدات.

رۆژێکیان نووسەرێک لەوڵاتێکی عەرەبی سەردانی کردین. لەمانگی رەمەزاندا. سەری سوڕما لەوتوندگرییەی رواڵەتەکانی بەرۆژووبوون لەلایەک و زۆری ژمارەی ئەوانەی بەرۆژو نین لەلایەکی دیکە. دەشێ زێدەڕۆیی نەبێت گەر بڵێین موسڵمانی عێراقی لەهەموو خەڵک زیاتر لەوکەسە تووڕە دەبێت کەبەرۆژو نابێت و لەهەمان کات لە هەمووان زیاتر رۆژوو دەشکێنێت! ...

هەروەها دەتوانین بڵێین تاکی عێراقی لەهەمووکەس زیاتر نیشتمانی خۆی خۆش دەوێ و ئامادەیە بۆ خزمەتی سەربازی (ئاڵا). کەچی لەراستیدا ئامادەیە خۆی بدزێتەوە لەخزمەتی (ئاڵا) واتە لەخزمەتی سەربازی گەر وەختی هات. (٣١)

لەهەموو خەڵک کەمتر دەست بەئایین دەگرێت کەچی لەهەمووان زیاتر رووەدەچێت لەکێشەو ململانێی نێوان ئایینزانەکان (مەزهەبەکان) دەیبینین لەلایەک خوانەناسە کەچی لەلایەکی دیکە بەرگری لەتایفەگەری دەکات.

عێراقی دەیبینیت بەگوڕە، لەوکاتەی رەخنە لەکەسانی دیکە دەگرێت

سەبارەت بەبنەما بالاکان و پاراستنی دادپەروەری و لێبوردەیی و دڵسۆزی و دلۆڤانی، بەڵام لەهەمووکەس پرکێشی زیاتر دەکات و دەستپێشخەرە لەدەستدرێژی کردنەسەر کەسانی دیکە، بەلێدان و پەستان، کەبارودۆخی لەباری بۆ هەڵکەوت. بەم شێوەیە ئەو دووڕوو نییە یان خۆڕادێر (مرائي) وەک هەندێک پێیان خۆشە ئەو ناوەی لێ بنێن. بەڵکو لەراستیدا خاوەن دووکەسایەتییە لەوکاتەی کە بەیەکێک لە کەسایەتییەکانی کاردەکات، ئەوەی لەبیرنامێنێت کەبە کەسایەتییەکەی دیکەی چی کردووە.

ئەو، کەوا بانگەواز بۆ نموونە بالاکان دەدات یان بنەما بالاکان، لەوەی دەیڵێت راستگۆو دڵسۆزە. مکووڕە لەسەربانگەوازەکەی. بەڵام گەر دواتر پێچەوانەی ئەوە جووڵایەوە، ئەوا لەبەر دەرکەوتنی دەروونێکی دیکەیە تیایدا نازانێت دەروونی یەکەم چی وتووەو چیکردووە. دەشێ، بەنموونە بانگەواز بۆ نەکڕینی کالای زایۆنی بدات، لەدانیشتنی پیاوماقولان و کۆڕی وتوێژ، بەڵام کەچووە بازاڕ، ویستی کالایەک بکڕێت، دەبینین ئەوەی وتی، لەبیری کردووە، بەپەلە هەر کالایەکی بێت دەیکڕێت، گەر نیشانەی باشی و هەرزانی لەسەربوو، بێ گوێدانە پرسیارکردن لەوەی کەئایا کالایەکی زایۆنییە یان زایۆنی نییە، جارێکیان وارێکەوت ئاهەنگێکی گەورە لەبەغدا گێڕدرا بۆ بانگەوازکردن بۆ نەکڕینی کەلوپەلی بیانی، دوانبێژەکان چەندان وتاریان خوێندەوەو دەزرانگایەوەو شاعیران چەندان چامەی ئاوەدانیان خوێندەوە، تێبینی ئەوەکرا کەوا زۆربەی دوانبێژەکان و شاعیرەکان جل و بەرگیان لەکووتاری بیانی دروست کرابوو، خوا پەنامان بدات!

بەم شێوەیە دەتوانیت چەندان نموونە بێنیتەوە بۆ پشتگیری ئەوەی وتمان سەبارەت بە دووفاقی کەسایەتی تاکی عێراقی. بۆ توێژینەوە لەهۆیەکانی ئەم دووفاقیە واچاکە ئاگامان لەو بابەتە هەبێت لەسێ لایەن:

١- لایەنی ژیاری (الحضاري)!

٢- لایەنی کۆمەڵایەتی.

٣- لایەنی دەروونی.

بابەلایەنی ژیاری دەست پێبکەین:
یەکێک لەسەیرترین رێکەوت لەوەدایە بەراستی عێراق، رەنگە زیاتر لەهەر وڵاتێکی دیکە کەوتبێتەسەر کەناری دەوارنشینی (بەدەویاتی) و شارستانیەتی (مدنیە) بەیەکەوە. لانەی شارستانیەتێک بوو ئەمڕۆ بەکۆنترین شارستانییەتی مرۆڤایەتی دەژمێردرێت، لەکەلەپووری ئایینیدا هاتووە کەوا ئادەم لەخوارووی عێراق نیشتەجێ بووە(٣٢).
ئەمە لەلایەک لەلایەکی دیکەوە دەبینین کەوا دەکەوێتە کەناری بیابانی پەلەدەوارنشین و هەرێمەکانی دەوروبەری ماوە بەماوە تەیار دەکات بەپێلی یەک لەدوایەکی دەوارنشینان.
لەراستیدا لەزۆر ناوچەی سەرگۆی زەوی بیابانی تێدایە. بەڵام ئەم بیابانەی رۆخ عێراق سیفەتێکی تایبەتی هەیە، بەدرێژایی سەدەکان سیفەتی وشکانی رووڵەزێدەبوونە.
ئەم بیابانە لەچاخەکۆنەکاندا پڕ ئاو وو بەرووبوومی بە پیت بوو، لەبەر ئەوە دانیشتوانەکانی زۆربوون، بەڵام هۆکارە جیۆلۆجیەکان دوای کشانەوەی چەرخی بەستەڵەکی چوارەم بووە هۆی کەم بوونی بەرەبەرەی باران لەم بیابانەدا (٣٣) کەوای کرد دانیشتوانی بۆ وڵاتانی دەوروبەری کۆچ بکەن. عێراق لەم پێلە دەوارنشینانە زۆرترین بەشی بەرکەوت، لەبەر ئەوەی زەویەکەی بەپیتەو شارێکی کشتوکاڵی سەرنج راکێشی هەبوو هیچ بەربەستی نەبوو وەک چیا یان دەریا یان شتی دیکە کەرێ لە دەوارنشینان بگرێت لەخزانە ناوچەکە(٣٤).
دەشێ عێراق لانەی یەکەم پێکهاتنی یەکەم دەوڵەت بووبێت لەمێژوودا، پەدابوونی دەوڵەت بەگشتی، وەک ئوینهایمەر دەڵێت، هەڵمەتی دەوارنشینەکان بۆسەر دانیشتوانی دێهاتەکان و زاڵ بوون بەسەریاندا لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین عێراق لەهەرێمە بەراییەکانی جیهان بوو کە دووچینی تێدا دەردەکەوتن:
چینی فەرماندار چینی بەرفەرمان، یان بەدەستەواژەیەکی دیکە:
سەرکەوتوو و ژێرکەوتوو. ئەم راستییە ژیارییە دەمانگەیەنێتە ئاکامێکی زۆر گرنگ! لەعێراقدا دەبینین، هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی شارستانییەتەوە،

دووچین یان دوو ژیاری لەملمـلانێـدان: ژیاری دەوارنشـینە جـەنگاوەرەکـان لەلایەک و ژیاری کشـتوکاڵی مل کەچ لەلایەکی دیکەدا. لەعێـراقدا کـەواتە لەسەر ئەم بنچینەیەدا، دوو سیـــتەمی بەهاکان دروست بووە: سیستـەمێک باوەڕی بەهێزو ئازایەتی هەیەو بەهاکـانی سـەرفرازی و ئازایەتی و فـیزداری و شکۆداری...هتد تێیدا باوە لەسـیفەتەکانی جەنگاوەری داگیرکەرکە لەتەک ئەویشدا سیستەمێکی دیکە هەیە باوەڕی بەماندوو بوون و خۆراگری و باجدان و ملکەچی و بۆخۆگریان هەیە. ئەم ململانێیە ژیارییە، یان ئەوەی کەلەزانستی ئینثرۆپۆلۆجیا پێی دەوترێت: پێکدادانی کلتوورەکان (CLash of Cul-tares)، کاری کردۆتەسـەر کەسایەتی تاکی عێراقی کارتێکردنێکی قووڵ و کاریگەر. تاکی عێراقی ناچاربووە هەردوو جۆرە بەهای کۆمەڵایەتی وەرگرێت. یان لاسایی هەردوو چینە خەڵک بکاتەوە: چینی دەوارنشینی سـەرکەوتوو و چینی جوتیاری ژێرکەوتوو، جارێکی باوەڕ بەململانێ و خۆهەڵکێشان هەیە یان هەوڵ دەدات تواناو هێزی خۆی بەرامبـەر کەسـانی دیکەدا دیاربکات و، جارێکی دیکە ناڵەناڵیەتی لەبەدبەختی خۆی و سـکالایەتی لەزۆرداری خەڵک بەسەریەوە.

هەندێ جار دەیبینی سـێڵی خۆی بادەداو سینگی دەردەپەڕێنی دەڵێ:« من رۆستـەمم. بە پێغەمبەر، حەوت دەوڵەتان دەروخێنم» هەندێ جـاری دیکەش دەبینی خەمـبارەو دەڵێت:« هەوڵ و کـۆشش چ سـودێکی هەیە ئەگـەر بەخت خەوتبێت من هەردەڵێم ئاخ یادی رۆژانی رابردوو دەکەمەوە... زۆردارن بەزەییتـان تێدانیە. ئای ئەوانەی زوڵمتـان لێکردم پیاوەتی کـوانێ، دڵتان سووتاندم...»

گـوێ لەگـۆرانیـەکـانمان بگرن دەبینن پڕیەتی لە سـکالاو هەست بەئێش و ئازارکـردن... ئەوەی لەم بارەیەوە دەوترێت ئەوەیە خـوێندکـارێکی عێـراقی لەوانەی لەئەمەریکا دەخـوێنن جارێکیان چووەسـەردانی برادەرێکی عێـراقی لەوێ، لەماڵەوە نەبووە، لەگەڵ خاوەن ماڵەکە دانیشت و لەبارەی ئەم برادەرەی قسەیان دەکرد، ئافرەتەکە لەوەسـفی لاوە عێراقیـەکەی خانووەکەی دەیوت

کوڕێکی چاکە بەڵام هەر ئەوەندەی چووە گەرماوێ دەست بەگریان دەکات. ئەم خوێندکارە دەڵێ لەم قسەیە سەرم سوڕما دانیشتم چاوەنواڕی برادەرەکەم دەکرد کەهاتەوە لێم پرسی لەبەرچی لەگەرماودا دەگرییت ووتی: نەخێر ... لەگەرماودا نەگریاوم، بەڵام لاوکم دەوت (أبوذیە) و بەس. لەراستیدا گۆرانیەکانمان هەموو گریان و رۆرۆیە، عێراقی لەناخاوتنەکانیدا جنێودەدات و لەگۆرانیەکانیدا دەگرییت.

کەگۆرانی دەڵێت دەگرییت، بەڵام کەبارودۆخێکی یاریدەدەری بۆ هەڵکەوت دەستدرێژی دەکات و هێرش دەبات یان بەتوورەییەوە جنێودەدات. بەهەڵەدا ناچین گەر بڵێین عێراقی گەر رووبەرووی کەسێک بێتەوە لەخۆی بەهێزتر بێت ملکەچە (مازۆکییە) کەچی گەر رووبەرووی بێ هێزێک بێتەوە تووڕەو (سادی)یە.

دووبارە دەیڵێمەوە ئەم دیاردەیە لەدەروونی هەموو مرۆڤێکدا هەیە، بەڵام لەدەروونی مرۆڤی عێراقیدا بەهێزترو ئاشکراترە لەبەرئەوەی بەهاکانی دەورانشینی و کشتوکاڵی جووت بوونە لەعێراقدا هەر لەکۆنترین رۆژگارەوە و هێشتاو هەتا ئەمڕۆش لەدەروونماندا لەململانێدان (٣٥).

ئەم دووفاقیە جیاواز بوون لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە لەسەردەمی عەباسییدا جێگیربوو. لەوکاتەی بەغدا بووبە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی. لەوکاتیدا لەعێراقدا زۆربەی زانستە ئیسلامییەکان پەیدابوون و لۆجیکی یۆنانی وەرگێردرا گەرناوڕێک لەوبیرمەندانەی کە هاوبەشیان لەم بزووتنەوە زانستییە مەزنەدا کردووە بدەینەوە دەبینین زۆربەیان لەچینی ژێر دەستن، زۆربەیان شارستان بوون و کەسیان لەرۆڵەکانی دەوارنشینان نەبوون، ژمارەیەکی کەمیان نەبێت، ئەوەش واتای وایە لەوکاتیەوە بیرکردنەوەمان شێوازێکی نموونەگەری دنیانەویستی مل کەچی بەخۆوە گرتووە.

بەڵام کارەکانمان لەژێر بەها دەوارنشینەکان مایەوە لەبەر ئەوەی بەراستی بەهای باوبوون لای چینە بالاکان بەم شێوەیە لە دوو جیهانی لێک جیاواز دەژیاین، جیهانی بیری نموونەیی لەلایەک و جیهانی کرداری و واقیعی

لەلایەکی دیکە هەریەک لەئێمە لەسەر بنچینەی لۆجیکی ئەرستۆتالس و نموونەگەری ئایینی گەنگەشەی دەکات، کەچی لەراستیدا رۆڵەی ئەم دینایە بە تووڕەو پڕ ئێرەییەیە.

جێی سەرسوڕمانە لەنێو رۆشنبیرانمان و پیاوانی ئایینیدا کەسانێک ببینین کەبەئاشکرایی خاوەن کەسایەتی دووفاقی بێت: جارێکیان لەبارەی نموونە بالاکان لەگەڵت دەدوێت و رەخنە لەوەدەگرێت کە دژی ئەو بۆچوونەبێت، جارێکی دیکە دەستدرێژی دەکات یان هەڕەشەی دەستدرێژی کردن دەکات لەبەر هەر هۆیەکی بێت کەبیوروژێنێت و تووڕەی بکات. هەرچۆنێک بێت هیچ و پووچ بێت یان گرنگ، ئەو نموونە بەرزانەی کەلەپێش کاتژمێرێک بانگەوازی بۆ دەدات وەلادەنێت.

لەو رێکەوتە سەیرانە، کۆمەڵگەی عێراقی لەسەرەتای ئیسلامدا نشینگەی ژمارەیەکی زۆر لەگەورە پیاوانی بیرکردنەوەی ئایینی و بەناوبانگەکانی لۆجیک و فەلسەفەبوو، زۆر لەیاوەرانی پێغەمبەر لێرەدا ژیاون. (٣٦)

هەر لەعێراقدا تیمی موعتەزیلەکان (گۆشەگیرەکان) دەرکەوتن و هەرلێرەدا زۆر لە خوتبەکانی سۆفیگەری و پیشەوایانی ئیسلام دەرکەوتن. ئەم ناودارە خێرخوازانە بیری کۆمەڵگەی عێراقیان بەجۆرێک مۆرک رێژکرد کەنموونەگەری بەسەردا زاڵ بێت و وایانکرد داب و نەریتی باو لەعێراقدا ئامانجی رێزگرتن بێت لەئەرک و کۆشش و بەمەزنگرتنی ئاکاری چاک بێت.

لەبەر ئەم هۆیە تاکی عێراقی راهاتووە لەدووان و نووسینەکانیدا لەسنووری ئەرکەکانی ئاییندا بێت یان لۆجیک پێویستی دەکات لەبیری بەرزو بەڵگەی یەکلاکەرەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی هیچ لەرێبازی ژیانی رۆژانەی خۆی بگۆڕێت. لەبەرئەم هۆیە دوو کەسایەتی لەبەردایە یان دووخودی جیاواز: خودێک بیری پێ دەکاتەوەو خودێک کاری پێدەکات. دوورایی نێوان ئەم دووخودەش یەکجار زۆرە! بەڕێزان، عێراقیەکان لەسەرەتای ئیسلامدا بەوە بەناوبانگ بوون خەڵکێکی دووروو پەرتەوازە خوازن هەندێ بیرمەندانی کۆن وەک جاحز (جاحظ) بەنموونە (٣٧)هەوڵی داوە ئەم دیاردە کۆمەڵایەتیە

لەعێـراقـدا راڤـەبکات واتـە: لەبەرچی عـێـراقـیـیـەکـان خـەڵکانێـکی دوو ڕوویەرتەوازە خـوازن؟ لەبەرچی هەندێ سـەرکـردە هاندەدەن بۆ شـۆڕش و دواتر وای لێدێت لەکاتی تەنگانەدا وازیان لێ دێنن؟

بیـــرمـــەندە کـــۆنەکـــان هەوڵـیـــان داوە ئەم دیارەیە راڤـــەبکەن، بەڵام سەرنەکەوتوون، ئێـمـەش ئەمڕۆ کـەهەوڵ دەدەین لەبەر ڕۆشـنیـایی کۆمـەڵزانی نوێدا راڤەی بکەین، دەبینین ئاشکرایەو پێویستی بەراڤەیەکی سـەختنییە.

تاکی عـێراقـی لەژیانی ڕۆژانەیدا لەخـەڵکانی دیکە جیـاواز نـیـیە لەگـەڵ لوزەوی ژیان دەڕوات بەدوای ناوبانگ هەروەها بەدوای جێگیری و دابینکردنی پێداویـسـتـیـەکانی دادەگـەرێت. لەوەدا هیچ جیـاوازی لەگـەڵ کـەسـانی دیکەدا نیـیە. جیـاوازی تەنیا لەبیرکردنەوە نموونەگەرییەکەیدایە، بیر لەچەندان بنەما دەکـاتەوە توانای جێ بەجێکردنیـانی نیـیـە، هەروەها بانگەواز بۆ ئامـانجێـک دەدات کـەناتوانێت بیـگاتێ، لەبەر ئەوە بەسـەرکـردەکـان دەڵێت راپەڕن من لەگـەڵتـاندام، دواتر کـە رادەپەڕن مـەترسی لەراپەڕینەکـەیان دەکـات و خـۆی لەماڵەوە دەشـارێتـەوەو گلەیی لە ڕۆڵی گـەردوون دەکات، لەم بارەیەوە وتراوە بەگوڕوجۆشی عێراقیـەکان وەک ئاگری پووشێ وایە هەرکە گڕی گرت ئەوەندە نابات دەکوژێتـەوە، لەگەڵ نموونە بەرزەکان گڕدەگرێت و لەڕووداوەکانی ژیان و ڕۆژگـــار خـــامـــۆش دەبێـــتـــەوە، دەشێ بەهەڵەدا نەچووبین کـــەوا ئەم ڕێچکە «پووشانییە» لەهەموو کۆمەڵگەیەکی ئایینیدا بڵاوە کەوا بنەماکانی ئایین تێدا زاڵەو ڕێنوێنییەکانی تێدا بڵاودەکاتەوە.

شایانی وتنە تێبینی ئەوەکراوە کەوا هەرشارێک پیاوانی ئاییـنی تێدا زۆربن ئەوە یەکـجـار دووفـاقی کـەسـایەتی تێـدا بڵاودەبێـتـەوە. چونکە مـرۆڤ لەم کۆمـەڵگەیەدا ناچارە لەژیانـیـدا لەلایەک بەپێی پەیڕەوی ئایین بجـوڵێـتـەوەو لەلایەکی دیکە بەپێی پێداویستیەکانی دنیا بجوڵێتەوە.

پیـاوی ئایین ئاسـایی پیـشـەی بڵاوکردنەوەی ئایینە، بەوشە بڵاوی دەکاتەوە، (دەســـتـــمـزد) پارەی لەباتـی وەردەگـرێت، بەڵام ئەم کـرێیـە زۆربەی جـاران کـەسـانێـک دەیدەن دوورن لەرێنوێنییـەکـانی ئایین. لەکـارەکـانیـاندا، کـەواتە

پیاوی ئایین ناچارە بەکردەوە لەگەڵیان بڕواو بەقسە دژیان بێت و زۆرجاران دەکەوێتە تەنگژەوە بەهۆی ئەم ئەسازییەو « لاحەولە ولاقوة ئیلا بیلا ».

گەر لە کۆمەڵگەی عێراقی بکۆڵینەوە وەک لەسەردەمی عوسمانیدا بوو، ئەوسەردەمەی خەڵکی عێراق چەند سەدەیەک لەژێر تیری ئەواندا دەیان ناڵاند، ئەوا چەندان وێنەی پێکدادانی ژیاری دەبینینەوەو کێشەو ململانێی بەهاکان شتێکی سەیروسەمەرە دەدۆزینەوە. حکومەتی ناوەندی ئەوکاتی زۆر بێ هێزبوو بەتایبەتی، ئەیدەزانی زۆر لێکراوێک بپارێزێت یان زۆردارێک ڕەتداتەوە، خەریکی باج کۆکردنەوەو زۆرترکردنی بوو لەسەر ئەرک و ماندووبوونی هەژاروو بێ هێزان. ئەم حاڵەتانە بوون هۆی بڵاوبوونەوەی شێوازە خێڵەکییەکان بۆ پاراستنی خەڵک و دابین کردنی ئاسایش لەم بارەیەودو لەو سەردەمە دواکەوتووە دەگێڕنەوە کەزۆر لەشارە عێراقییەکان هەوڵی داوە لەسەر بنچینەیەکی خێڵەکی خۆی کۆبکاتەوە سەرەک خێڵ بۆ خۆیان هەڵبژێرن و داوای تۆڵەو ئەم جۆرە داب و نەریتە خێڵەکیانە بکەنەوە.

ئەم بارودۆخە بووە هۆی ئەوەی بەها دەوارنشینەکان یەکجار زۆر بڵاوبنەوە لەکۆمەڵگەی عێراقیدا، تاکی عێراقی هێز زۆر بەمەزن دەگرێت و خۆی پێ هەڵدەکێشاو شارچییەتی دەکرد یان گەڕەکچییەتی وەک چۆن دەوارنشینەکان دەمارگیریان بۆ هۆزو بیابان هەبوو. دەگێڕنەوە زۆر لە سەرۆکەکانی شار هەوڵیان دەدا بەشەو بەسەر ماڵاندا بدەن و دزی بکەن یان پیاوان بکوژن بۆ ئەوەی پێیان بڵێن (پیاوی شەوانن) گوایە بەوەش شوێن و پلەو پایەی لەبار لەکۆمەڵگەدا بەدەست دێنن. من کەسێک دەناسم سەرۆکێک بوو لەسەرۆکەکانی سەردەمی کۆن زۆر دەوڵەمەندبوو. لەگەڵ ئەوەشدا بەشەوخۆی دەگۆڕی بۆ ئەوەی بەسەرماڵاندا بدات و پاڵەوانیەتی شەوانە بنوێنێت، بەوەش خەڵک ڕێزیان دەگرت و لێی دەترسان. بڵاوبوونەوەی ئەم بەها بەددویانە لەکۆمەڵگەی عێراقی تۆخمێکی نوێی خستە دووفاقی کەسایەتی. ئەم پاڵەوانەی بەشەو بەسەرماڵاندا دەدات. لەڕۆژدا ناچاربوو مل کەچی نموونە بەرزەکانی ئایینی بێت. دەی بینی بەرۆژ بەرگی چاکەخوازی و ڕێزداری

پۆشیوەو دەچێتە مزگەوت. نوێژەکات لەخوادەپاڕێتەوە بیباتە بەهەشت، کارەکانی شەوی لەبیرچۆتەوەو تاوانەکانی لەبیرنەماون، وەک ئەوەی کاری شەوێ پەیوەندی بەکاری ڕۆژەوە دەبێت.

خوشکان برایان:

دوای ئەم شیکردنەوە ژیارییەی کەیەک بەدوای یەک بەدوای داچووین لەمێژوودا هەرلە سەردەمی سۆمەریەکانەوەو دواتریش عەباسییەکان و عوسمانیەکان ڕوولەشیکاری کۆمەڵزانی دەکەین، ئالێرەدا دەبینین هۆکارێکی دیکە دەبێتەهۆی دووفاقی لەکەسایەتی تاکی عێراقی.

وێمان گرنگترین هۆکار لەپێکهێنانی کەسایەتی مرۆڤ بەگشتی ئەوەیە کە کۆمەڵزانان ناوی دەنێن کۆمەڵەی بەرایی، کەلە ڕاستیدا ئەو بۆتەیە یە کەوا کەسایەتی تاکی تێدا دەتوێتەوەو دەخرێتە قاڵبی کۆتایی. بائیستا بێیت ئەم کۆمەڵەی بەراییە وەک لەعێراقدا دەیبینین لێی بنۆڕین و لەکاریگەری لەسەر پێکهێنانی کەسایەتی عێراقیدا بکۆڵینەوە. من دوای لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژی کۆمەڵەی بەرایی (الجماعة الاولیة) لەعێراقدا. دیاردەی سەیرم تێبینی کرد کەم وادەبێت لەولاتانی دیکەدا هەبێت. دیاردەیەکی ئاسایی زەینمان لێی نیە لەبەرئەوەی لێی ڕاهاتووین و بەسروشتیمان داناوە، بەلام بیانی ئەم، شوێنکارەکانی بەئاسانی دەبینێت.

توێژەر لەخێزانی عێراقیدا دیاردەیەک دەبینێت دەشێ ناوی بنێین (پاژپاژبوون) مەبەستم لە (پاژپاژبوون) ئەو دابەشبوونەیە کەلەشێوازی ژیانی نێوان پیاو ئافرەت و منداڵدا تێبینی دەکرێت، گەر بزانین خێزان لەکاکڵدا لەسێ توخم پێک دێت: پیاوو ئافرەت و منداڵ، دەبینین هەریەک لەم سێ توخمانە لایەنێکی گرتووە یان بوارێکی لەژیان گرتووە جیایە لەلایەنەکانی دیکە.

بواری ئافرەت ماڵەو پێویستە لێی دەرنەچێت و پیاو لەکاتی بێ ئیشیدا چایخانەیە، و منداڵ دەچێتە کۆلان و لەگەڵ هاوتەمەنەکانیدا، بەم لاو بەولا بەرەڵلا دەبێت.

لەم جیهانەدا کەم وادەبینین کۆمەڵگەیەک بەم شێوەیە خێزان تیایدا ئەوەندە بەقووڵی پاژپاژ بێت عێراق بەچایخانەکانی بەناوبانگە. هەرچەندە لەبچووک ترین لادێ تاگەورەترین شاری عێراق چایخانە هەیەو یەکجار زۆرن. ئەم دیاردەیەش دەشێ هۆیەکەی یەکەم سەرپۆشی ئافرەتان بێت (حجاب)، دووەم پیاو خۆی لەوە گەورەتر دەگرێ کەلەماڵەوە بمێنێتەوە لەگەڵیدا.
چەندان بەهامان لاپەیدابووە. وانیشاندەدات کە ئافرەت رەگەزی لەپلەیەکی خوار پیاو دایەو کەم ئەقڵ ترە ئەوەشیان وادەکات پیاو بەرامبەر ئافرەت هەست بەخۆبەزلزانی و فیزبکات. گەر خەڵک زانیان پیاوێک زۆر لەماڵدا دەمێنێتەوە لەگەڵ ژن و منداڵەکانی بەنێرەمووک ناوی دەبەن. زۆر نموونەمان هەیە سەبارەت بەبڵاوبوونەوەی ئەم بەها کۆمەڵایەتیانە لەنێوانماندا. دەشێ ئەم بەهایانە لەدەوارنشینیەوە پێمان گەیشتبێت، کۆمەڵگەی دەوارنشین، وەک وتمان کۆمەڵگەیەکی هێرش و شەڕە، تەنیا پیاویش ئەرکی شەڕو تێکۆشانی لەسەرە، بەڵام ئافرەت ئەرکی نزمترە لەئەرکی پیاو لەبەرئەوەیە چاوی بەکەم زانی و بچووکزانییەوەی دەنوارن. دەوارنشینەکان بەوکەسەی کەزۆر لەگەڵ ئافرەتاندا دادەنیشێت، دەڵێن« ژنانی» ئەو نازناوەش پیاوی دەوارنشین ناتوانێت چاوپۆشی لێبکات کەواتە ناچارە زۆربەی کاتەکانی لەدیوانی شێخدا بەسەربەرێت بۆ ئەوەی لەگەڵ دانیشتوان لەبارەی پاڵەوانیەتی و چیرۆکەکانی هێرش و ئازایەتی بگێرنەوە. ئەم خوونەریتەمان لەدەوارنشینەکانەوە وەرگرتووە، دیوەخانەی بیابان بۆتە چایخانە لەشار، وای لێهاتووە پیاو هەر لەخواردن بووەوە لەماڵەوە یەکسەر عەباکەی بەسەرشانی داداو دەچێتە چایخانە. کەواتە تەنیا لەکاتی نان خواردن و خەوتن ماڵەوە دەبینێت کەماوەیەکی زۆرکەم و بێ سوودە. بەڵام ئافرەت وا راهاتووە لەماڵەوە بمێنێتەوەو لەو باوەڕە دایە ئەوە باشەو بەنیشانەی داوێن پاکی و سەربەرزی دەزانێت. هەر لەمنداڵییەوە، لەبن گێی خوێندراوە کەپێویستە خۆی داپۆشێت و نەچێتە دەرەوە بۆکاری زۆر پێویست نەبێت. شارێکی عێراقی هەیە خەڵکەکە شانازی پێوەدەکەن کەوا ژنەکانیان مەگەر بەدەگمەن دەنا لەسەر شەقامەکاندا

نابیندرێن، گەر یەکێکیان ناچاربوو بچێتە دەرەوە هەوڵ دەدات لەرێگا پڕ ئاپۆرەکان دوورکەوێتەوە بۆ ئەوەی بەژن و باڵا داپۆشراوەکەش نەبینن.
لەبەر ئەم هۆیە دەبینین ماڵی عێراقی یەکەیەکی سەربەخۆیە هەروەها بەهاو رێسای سەربەخۆی هەیە کەلەرێساکانی جیهانی پیاوان بەتەواوی جیایە. ئەوەشیان بێ گومان یاریدەی فراژی بوونی دووفاقی دەدات لە کەسایەتی پیاو و ئافرەت. لەبەر ئەوەی هەریەکێکیان دەکەوێتە بەر بەهاکانی رەگەزەکەی دیکە بەشێوەیەکی ئاناگا یان ئاگایانە سەرەڕای بەها تایبەتییەکانی رەگەزی خۆی بەم شێوەیە لەکەسایەتیدا دوو سیستەمی لێکدژی بەهاکان پێکدێت. زۆر لەو ئەسازییانەی لەپیاوان و ئافرەتانمانی دەبینین دەشێ بیگێڕینەوە بۆ ئەم لێک جوداییە زۆرەی نێوان هەردوو جیهانی ئافرەت و جیهانی پیاو سەرەڕای ئەوەش دەبینین ئەم لێک جوداییە زۆرجاران دەبێتە هۆی لادانی سێکسی.
لەڕووی زانستییەوە سەلمێندراوە کەوا لادانی سێکسی بەزۆری دەردەستکراوە، ودرگیراوە، هۆیەکەی لەیەک جیاکردنەوەی ئافرەتە لەپیاو وەک لەحاڵەتی سەربازاندا هەیە کەماوەیەکی زۆر لەبەرەکانی جەنگدا دەبن دوور لە ئافرەتان، هەروەها لەلای دەریاوانان و گیراوان و ئەوانەی زۆر کەم پەیوەندییان بە ئافرەتەوە هەیە. (٣٨)
دەبینین لەعێراقدا لادانی سێکسی زۆر بڵاوە ئەویش بەهۆی ئەم لێک جیاکردنەوە توندەی نێوان پیاو و ئافرەتە، لەبەر ئەم هۆیە دەبینین زۆربەی گۆرانییەکانمان بەوشەی (نێرینەیی) لەگەڵ خۆشەویستەکەی دەناخفێت. ئەوشتەی لەوڵاتانی دیکە بەدەگمەن ئەگەر هەبێت. زۆرینەی هۆنراوەکانی خۆشەویستیمان (ئەواسیانەیە) واتە بەنێرینەدا هەڵدەڵێن واتە لەبازنەی هەمان خۆشەویستی کەئەبو ئەواسی داماو دەخولێتەوە. لەبەدبەختی خۆمان عێراق لانکەی یەکەم بڵاوبوونەوەی سەرپۆش (حجاب) بوو لەشارستانییەتی ئیسلامی و هەروەها جێ سروشی ئەبونەواس بوو.
ئەوەشیان لەلای ئێوەی بەڕێز شاراوەنییە کەوا لادەری سێکسی دەردی دووفاقی کەسایەتی تێدا زۆرترەو کەسێکە ئەوەی شاردویەتیەوە جیایە لەوەی

دەری دەبڕێت و بەدیاری دەخات، کەواتە ناچارە لەبەردەم خەڵک وادەردەکەوێت جیالەوەی لەدەروونیدایە، لەبەر ئەوە دووکەسایەتی هەیە، کەسایەتیەک بەرامبەر خەڵک خۆی پێ دەنوێنێت و کەسایەتیەکی دیکە بەدوای چێژی لاڕۆی خۆیدا دەبات.

دوای توێژینەوەمان لەباروودۆخی پیاو و ئافرەت دەگەڕێینەوە توخمی سێیەم کەمنداڵە، دەبینین لە کۆڵانێ یاری دەکات و کەسایەتی لە کۆڵانێ فراژیی دەبێت. زانایانی کۆمەڵزانی لەئەمەریکا تێبینی ئەوەیان کردووە کەوا چەتە بەناوبانگەکانی تاوان لەشیکاغۆ و شارە گەورەکانی دیکە هۆیەکەی بایەخ نەدانە بەمنداڵان لەهەندێ گەڕەکی هەژارانی ئەوێ.

زانراوە زۆربەی ئەندامانی ئەم چەتانە لە گەڕەکی هەژاران گەورەبوونە ئەو گەڕەکانەی خانووەکانیان تەنگ و پڕ ئاپۆڕەی دانیشتوانە. منداڵان ناچارن بچنە کۆڵان بۆ ئەوەی یاری تێدابکەن و گرووپی گەڕەک دروست بکەن کەلەراستیدا هەوێنی چەتە گەورەکانە بۆ پاشەڕۆژ.

سەیرلەوەدایە منداڵانمان لەعێراقدا بۆیاری دەچنە کۆڵانێ چ خانووەکانیان تەنگ بێت یان فرەوان، خانووەکانمان وادروست کراوە بۆ ژیانی سەرپۆشی دەشێت، تەنگە بەرەو لەهەموولایەکی داخراوە، بێ دارو گوڵە، مەگەر بەدەگمەن کەواتە منداڵ ناچارە بچێتە دەرەوە بەدوای یاری و خۆشیدا بگەڕێت دەشێ دایکیشی لەوەدا هانی بدات. چونکە پێشوازی لەمیوانانی دەکات بەم جۆرە منداڵی عێراقی بوارێکی گەورە لە کۆڵاندا دەبینێت، کەلەگەڵ هاوتەمەنەکانیدا جۆرە گروپێکی لەشێوەی چەتەکان پێک دێنن.

گەرگینای چەتەگەری لەئەمەریکا تەنیا لەگەڕەکە هەژارەکانی شارە گەورەکاندا پەیدابێت ئەوا لەعێراقدا لەشارو لادێ بەیەکەوە لەگەڕەکە هەژارەکان و دەوڵەمەندەکان بەیەکسانی پەیدادەبێت. شتێکی نهێنیمان نەدرکاندووە ئەگەر بڵێین ئەو بەهایانەی لەنێوان منداڵاندا هەیە لە کۆڵانەکان زۆر بەبەهای جەنگ دەچێت، ئەو بەهایەی تەوەرەکەی هێزو بەکارهێنانی هێزە بەهەموو ڕێگایەک. منداڵانی کۆڵانەکان، کەکەسێکی گەورە سەرپەرشتیان

ناکات، ئەو بەهایانەی لادەڕوێت وەک شانازی بەهێزکردن و خۆپێهەڵدان و هەوڵی زاڵبوونی و گەرەکچییەتی کردنی و لافراژیی دەبێن.

تەوەرەی خۆ هەڵکێشان لەکۆڵانەکاندا لەو جەمسەرەدا کۆدەبێتەوە کەبەدوو وشەی (بەهێزی و بێ هێزی) دەردە بڕدرێت، یان بەدەستەواژەیەکی رەمەکی، بەدووبێژەی (شێرو ژنانی) دەردەبڕدرێت. هەر منداڵێک هەوڵ دەدات بەهێزبێت و بێ هێزی لەخۆی دوورخاتەوە، نایەوێت پێی بڵێن (ژنانی)، خۆی پێ پاڵەوانە هەوڵ دەدات پاڵەوانیەکەی بەدەستدرێژی کردنەسەر کەسانی دیکە بەدەربخات، ئەوانەی لەو بەهێزترن لەڕووی جەستەو لەرووی یارمەتی دەر. لەهەمان کات دەمارگیری خۆجێی لەدەروونیدا فراژیی دەبێت، گەرەکچییەتی دەکات. دوژمنی گەرەکەکانی دیکەیە.

ئەم دەمارگیرییەی گەرەکچێتیە لەدەورەییدا دەبێتە دەمارگیری هۆزگەری یان شارگەری یان تایفەگەری یانی ئایینی یان هەرشتێکی لەم چەشنانە، بەم جۆرە تاکی عێراقی زۆر بەتوندی دەمارگیر دەبێت بۆ ئایینەکەی.

بەڵام هیچ لەنەرکەکانی ئایین نازانێت. ئەم کۆڵانگەرییەی منداڵی عێراقی لەگەورەییدا لەژێر پەردەیەکی ساختەی رێزو پێزانین بزر دەکرێت. منداڵی عێراقی کەگەورەبوو وەک ئەمەریکا چەتە پێک ناهێنێت لەبەرئەوە گیانی چەتەگەری لەلای بزردەبێت. لەهۆشی ناوەوەی دەیشارێتەوە. منداڵ لەوکاتییەوە خۆی پابەندی رواڵەتەکانی ئەدەب و ئایین و ناکاری چاک دەکات. ئێمە هەرلەتەمەنی بچووکییەوە منداڵەکانمان واڕادێنین کەخۆیان وەک پیاوان بەرێزو شکۆ بنوێنن لە بەردەم گەورەکاندا. (٣٩)

بەم جۆرە دووکەسایەتیان تێدا گەورە دەبێت: کەسایەتیەک بۆ کۆڵان، و یەکێکی دیکەش بۆ خۆنواندن لەبەردەم خەڵک.

دایک و باوک لەعێراقدا زۆرجاران منداڵەکانیان سەرکۆنە دەکەن گەر بزێوی بکەن کەناشێ لەبەردەم گەورەکان ئەم هەڵسوکەوتە بکەن.

کەواتە منداڵەکە هەوڵ دەدات بەناکاربێت گەر لەگەڵ باوکی چووە چایخانە، بەڵام دەبینیت ئەو دەمامکە ساختەیە فرێ دەدات کەلەسەری کردبوو لەگەڵ

باوکی، ئەو منداڵە کەگەورەبوو، لێرادێت ئەوشتە بڵێت کەخۆی نایکات، و بەهەڵپەو بەگوڕ دەبێت بۆ ئەوشتەی کەباوەڕی پێ نیە. ئامۆژگاری خەڵک دەکات بەشێوەیەک جیالەوەی کە ئامۆژگاری خۆی پێدەکات. دەشێ ببێتە رەخنەگرێکی پلەیەک، بزۆزو بەدوای دۆزینەوەی خەوشی خەڵکدا دەگەڕێت بەبێ ئەوەی خەوشەکانی خۆی بدۆزێتەوە، لەهیچ شتێ رازی نیە کەکەسانی دی دەیکەن هەرچەندە ئەوشتەش نزیک بێت لەتەواوی و رێک و پێکی.

خوشکان برایان:

لەم خاڵەدا لەهۆکاری کۆمەڵایەتیەوە دەچینەسەر هۆکاری دەروونی بۆ دەستنیشانکردنی کاریگەریەکەی لەپێکهێنانی کەسایەتی تاکی عێراقیدا. ئەم دوو هۆکارەی کۆمەڵایەتی و دەروونی، لەراستیدا لێک جودانابنەوە. لەبەر ئەوەی هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لایەنی دەروونی خۆی هەیە. هەروەها هەردیاردەیەکی دەروونی لایەنی کۆمەڵایەتی خۆی هەیە. هەندێ لەزانایانی شیکاری دەروونی دەڵێن: زۆر لەو نالەبارییەی دەروونی هەندێ کەس دەهاڕێت. لەوەوە سەرهەڵدەدات کەوا ئەوان ئاستێکی بەرزو بڵندیان بۆ خۆیان کێشاوە... ئەگەر [یەکێکیان] گەیشتە پلەو پایەیەک هێشتا خۆی وا دەبینێت کەوا لەجێگایەکی زۆر کەمترە لەوەی شایانییەتی، هەرچەند دەرفەتێکی بۆ رەخسا وادەزانێت کەوا ئەو مافی پلەی بەرزتری هەیە، ئەو جۆرە کەسە ناتوانێت چیتر لەبەختەوەری و رازی بوون ببینێت.

بەڵکو ئەهامەتی دەبەخشێتە خەڵکی دیکە، و ئەبوونی و بەدبەختی لەنێوانیاندا بلاودەکاتەوە، لەرێگەی رەخنەگرتنی بەردەوام لەرەفتاری هەڵسوکەوتیان هەرچەندە ئاکارەکان جوانیش بن. ئەم کەسە دەشێ تووشی دەمار شەکەتی (عصابی) بێت. هەمیشە لەکۆمەڵگە نارازیە، ئەو چاکەخوازییەی کەئارەزووی لێیەتی بەئاشتیەوە دەیپەرستێت لەو کۆمەڵگە پەیدا نابێت، بەڵام بەزۆری بێ ئەوەی خۆی ئەم چاکە خوازەبێت، لەخەڵک دوور دەکەوێتەوە، چونکە وادەزانێت ئەوان زۆر لەوپایە نزمترن، کەلەگەڵیان تێکەڵ بێت، خۆ ویستەو هەوڵ دەدات ئارەزووە تایبەتییەکانی خۆی جێبەجێ

بکات، چونکە ئەو ئارەزووانە بەباڵاترین داخــوازی و مــەزنتــرین ئارەزوودا دەبێت، و هەر ئەوان بەشــایانی ئەوە دەزانێت کــەبێنەدی. لەخــودە باڵایە نموونەییــەکــەی خــۆی بەزاناترین و باشــترین و بەرزترین کــەس دەزانێت لەم جیهانەدا، کەچی دەشێ لەخۆیدا بەراستی نەزانترین و نزمترین و پانترین کەس بێت لەجیهاندا»(٤٠)

تۆژەرەکـان ئەم دیاردە دەروونیـە لەهەندێ تاکە کەسـدا لێک دەدەنەوە کـەوا درێژەپێـدانی جـۆری ئەو هەڵسـوکـەوتەیە کەدایک و باوکیــان لەگـەڵ ئەوانی کردوونە لەکاتی کەئەوان منداڵ و بچووک بوونە.

« هەندێ لەدایک و باوکـان وا لەمنداڵەکـانیــان داوا دەکـەن کـەلەهەمـوو شتێکدا تەواوبن، لەکارو رەفتـارو ناخاوتندا، و هەر هەڵەو قـسـە پەڕاندنێک بەتوندی لێپـرسینەوەی لەگـەڵ دا دەکـەن. بەوچاوە تەمـاشـای دەکـەن کـەوا کــەســێـکی گــەورەیەو ئاوەزی تەواو و تێگەیشــتــووە، هێــزو توانای پێگەیشتوون..»(٤١).

لەو باوەڕەدایم ئەم پەروەردە توندوتۆڵە وشکە لەعێـراقـدا باوە، یەکـجـار بڕوانیـتە شێوازی پەروەردەکردنی لەخوێندنی فەقێیەتی (لای خۆمـان) کەپێشان و ئێستاش لەهەموو عێراقدا بڵاوە، ئەمە بۆ پشتگیری کردنی ئەم قسەیە.

باوک منداڵەکەی خۆی دێنێتە لای مامۆستایەک (مەلایەک) و دەڵێت« ئەوە کوڕەکەمە، فـێـری کـە ... گـۆشـتی بۆ تۆ ئێـسکی بۆ من» مەلا ئەوجـا وانە جیاجیاکان دەسەپێنێتە سەر ئەو منداڵە. پێویستە منداڵەکە سەرلەسەر خوێندن و نووسین هەڵنەگـرێت، ورتەی لێـوەنەیەت، تەمـاشـای ئەمـلاو ئەولا نەکـات! ئەوەی ئەم کارەی پێبکرێت ئەوا منداڵێکی ئاقڵ و بەئەدەبە، ئەوەی نەتوانێت، وای چی بەســەر دێت کــەواتە منداڵەکــە ناچارە توورەیی و ســۆزی خــۆی خەفەبکات و بچەپێنێت بەدرێژایی ماوەی خوێندن دوای ئەوەی دەردەچێت، دەبینین یاخی و شۆڕشکارە، دەستدرێژی دەکاتەسەر ئەم و جنێو بەوەی دیکە دەدات، و لەوی دیکەیان شتی دەڕفێنێت، لەم کارەیدا هەناسەیەک دەبینێت بۆ دەربازبوون لەم چەسپاندنە دوورو درێژە.

بەم جۆرە ئەو منداڵە دووکەسایەتی تێدا گەورە دەبێت و پەروەردە دەبێت: کەسایەتییەک: بەئەدەب و مل کەچ. کەسایەتییەک شۆڕشگێڕو یاخی و دەستدرێژیکەر.

تێبینی ئەوە دەکرێت کەوا قوتابخانە نوێکان هێشتا پاشماوەی ئەم گیانە کۆنینەیان تێدایە: گیانی توندگری و چەرپاندن و پێهەڵگوتن بەرێزی و زانست و ئەدەب و خوێندن. زۆر جاران داوا لەشاگردان (قوتابیان) دەکرێت لەم خوێندنگایانەدا زۆر رێز لەمامۆستاکەی بگرێت و وەک بەندەبێت بەرامبەری. لەسەر ئەو بنەمایەی کەدەڵێت «ئەوەی پیتێکم فێربکات دەمکاتە بەندە» بەم جۆرە منداڵ لەسەر چەندان خوورەوشت رادێت لەبەر دەم مامۆستاکەی کەجیاوازە لەوەی کەلە دەرەوەی قوتابخانەو لەنێو کۆڵانەکان فێری دەبێت.

لێرەدا پێویستە ئەوە بێنینەوە بیرخۆمان کەوا کەسایەتی هەوڵدانێکی مرۆڤە بۆ هاوسەنگ راگرتنی ئارەزووە سروشتیە بەگوڕەکانی و رێساکانی کۆمەڵگەی کەبووەتە ویژدانی ئەو. هاوسەنگ راگرتنی ئەم دووهێزە دژییەکە زۆر زەحمەتە، زۆرجاران مرۆڤ لەراگرتنی ئەم هاوسەنگیە سەرناکەوێت یان رێکهێنانی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ.

لەبەر ئەم هۆیەیە زانایانی بواری پەروەردەی نوێ دەڵێن واچاکە رێساکانی سەپاو بەسەر منداڵان پێویستە ئاسان بکرێن و بواری بدرێتێ ئارەزووە سروشتییەکانی ئازاد بێت و لەنێو سنوورێکی دیاریکراو فراژیی بن.

توندی لەپەروەردەو وشکی لەسزادان زۆر جاران دەبێتە هۆی پەیدابوونی ریاکاری و دووڕوویی لەومنداڵەدا « منداڵەکە ریاکارو دووروو پێدەگات، ئەوەی دەیڵێت مەبەستی نییەو ئەوەی مەبەستییەتی نایڵێ، و ئەوەی دەیکات بڕوای پێی نییە، و بڕوای بەوەیە کە نایکات.» (٤٢) دەتوانیت ئارەزووە سروشتیەکان لەمرۆڤدا بەرووبارێکی بەخوڕ بچوێنێت گەر رێگای لێ بگیرێت و لەمپەری بخرێتەرێ. بەسەر دەوروبەریدا بڵاوبێتەوەو بەروبووم و ژیان بنبڕ دەکات. (٤٣)

بەڵام ئەوەش مانای ئەوەنیە منداڵ بەرەڵلا بکرێت ئازاد بێت بەپێی ئارەزووە

سـروشـتـيـيـەكـان چى دەكـات بيكات، بەتەواوى ئازادبێت. ئارەزووە سروشتييەكان، پێويستەو دەبێ كۆنترۆڵ بكرێن و سوود لەوزە.شاراوەكەى وەربگيـرێت، وەك چۆن دەكرێ سـوود لە لوزەوى زێى بەخـورەوە وەربگيـرێت، بەڵام ئەوەى پێـويسـتـە ئەوەى لەسـروشـتى ئەم ئارەزووانەو ياسـاكـانى بەڕێوەچوونيان و هێزى لوزەوەكە بگەين، بەشێوەيەك بتوانين لەلايەك رابێين و لەلايەكى ديكە كـۆنتـرۆڵى بـكەين. دايك و باوكـمـان گـومـانيـان وابوو كـەوا دەتوانين كـەسـايەتيـمـان، وەك چۆن ئەوان دەيانەوێت دايبـڕێژين، هەوڵيـانداوە بەندى بكەن بەو گريانەو رێسايانەى كەوەك كەلەبەرن كەدەخرێنە رێگاى زێ ئەوەك بەنداو و ئەمبارو و شتى ديكەى سوود بەخش بێت.

لەبەر ئەم هۆيە منداڵى عێراقى لەژێر گرانى ئەم لەمبەرانەدە كەسەپێنراوەتە سەرى دەناڵێنێت و هەوڵ دەدات لێيـان ياخى بێت لەرێگاى لاوانى يان پشت لێ گرتن و فروفێڵ.

كەواتە بەروالەت واخۆى پيشـان دەدات كەوا رێز لەنموونە بالاكان دەگرێت كـەوا مـامـۆسـتـايان و دايك و باوكى پێى دەڵێن، بەڵام هەوڵدەدات خۆى لێ بدزێتەوە بەكردەوەو چەندان جۆرە بەهانەو رەوانيشاندان دەدۆزێتەوە بۆ خۆ لێ لادان.

فێڵ لەخۆى دەكات پێش ئەوەى فێڵ لەكەسانى ديكە بكات.

خوشكان برايان:

سـەريارى ئەم وشكە شێوازە پەروەردەييە دەبينين هۆكارێكى ديكەيش كار لەدەروونى منداڵ دەكات و دەمانگەيەنێتە هەمان ئاكام: هۆكارى جياكردنەوەى پياوە لە ئافرەت.

منداڵ كـەدەگـاتە تەمـەنى رەسـيـوى دەبينێت ئافـرەتى لێ شـاردراوەتەوە. ئارەزووى و تامـەزرۆيەتى بەڵام داب و نەريت بەسـەريانيـدا سـەپاندووە كـەوا پێچەوانەى ئەوەى لەناخى دايە دەربڕێت ، ناچارە مەيلە سێكسيە توندەكانى بچەپێنێت، پاشـان گـەنگەشـەى ئەوەبكات كـەپاكـەو مـەيلى ئافـرەت نيـيەو نايەوێت لێى نزيك بێتەوە. ئەوەيان، وەك وتمان دەكێشێتەوە سەر پەيدابوونى

دیاردەیەکی دیکە کەدەکرێ ناوی بنێین: لادانی دەروونی. فرۆیدو پێکارانی لەزانایانی شیکردنەوەی دەروونی دەڵێن مرۆڤ گەرشتێکی زۆر خۆشویست و ئەم خۆشەویستییەی لەناخی خۆیدا ساردەوەو، بۆ رەهاکردنی ئەم چەپاندنە، دەشێ پەنا بباتەبەر ئاژاوەو توند رەخنەگرتن و نارەزایی دژی هەمان شتی کەخۆشی دەوێت. بروانە رەفتارمان کەدەمار دەمانگرێت دژی شتەکان یان کەباسی ئەوشتانە دەکەین کە رقمان لێیەتی و بەخراپ باسی دەکەین، باشی بزانە ئێمە لەناگایی ناوەوەمان هەست بەمەیلێکی شاراوەو چەپێنراو ددکەین بەرامبەر ئەم شتانە خۆیان وەک برناردهار دەڵێت. (٤٤)

دەتوانین بڵێین ئەوەی رەخنە لەکەسانی دیکە دەگرێت، رەخنەیەکی بە زیادەرۆیی و توند، ئەوا لەم رێگایەوە سۆزێکی چەپێندراو دەردەبڕێت، زۆرجاران یەکێک لەئێمە شتێک لەیەکێکی دیکە دەبینێت رەخنەی لێ دەگرێت گەر لەباری دەروونی بکۆڵینەوە، دەبینین ئەوشتەی زۆر خۆش دەوێت، بەڵام نەیتوانیوە دەستی بخات ئەوا دەست بەرەخنەگرتن دەکات لەوەی کەدەستی کەوتووەو هێرش دەکاتە سەری وەک دامرکاندنەوەیەکی بێ بەشبوونە چەپێندراوەکان. (٤٥)

ویلز دەڵێت ئەوانەی دەنگ و هەرایانە دژی خۆششتنی تێکەڵ لەکەناری دەریادا یا دژی ئەوە ئافرەتانەن جلوبەرگێکی وایان هەبێت لەگەڵ نابرووداری نەگونجێت وەک دەڵێن، کەم وادەبێت لەزاناو پەندیارانن ئەوانەی کە توانیان ئارەزوودکانیان هۆشمەندانە رێک بخەن. ئەوانیش ئاسایی هەندێک لەوانەی کەغەریزە توندەکانی خۆیان چەپاندووە وەک ئەوەی هەست بەشتێکی شاراوە بکەن ئەم هاندەرە بەگورانە کە نزیکە بیانخەنە کارەساتی ئاکاردکی قووڵەوە. (٤٦)

گیروگرفتی چەپاندن، خەڵک راست بڵێ، گیروگرفتێکی سەختە تاکی عێراقی دووچاری بووەو کەسایەتی بەهۆیەوە ئاڵۆز دەبێت ئاڵۆزییەکی توند.

مرۆی عێراقی بەوە بەناوبانگە کەوا رەخنە لەکەسانی دیکە دەگرێت، خانمێکی ئەمەریکی - کە رۆژێکیان سەردانی عێراقی کردبوو - دەڵێت: «

مرۆی عێراقی بەتوانایە خەوش لەکەسانی دیکە بدۆزێتەوەو کارامەیە لە بەرە بەرە خستنەرووی، لەراستیدا هەریەک لەئێمە رەخنە لەکەسانی دیکە دەگرێت و هەریەک لەئێمە وێران بوونی وڵات دەخەینە ئەستۆی کەسانی دیکە، ئەوە لەبیرخۆی دەباتەوە کەوا کەم یان زۆر ئەویش خۆی هاوبەشە لەم وێرانکردنە گشتییە. فەرمانبەرانی حکومەت رەخنە لەحکومەت دەگرن وەک ئەوەی لەکەسانی دیکە پێک هاتبێت.

هەرکەسێک رەخنە لەخەڵک دەگرێت وەک ئەوەی لەوان نەبێت، لەراستیدا هەریەک لەئێمە تووشی هەمان دەرد هاتوون کەلەکەسانی دیکەی دەبینێت.

فەرمانبەری بچووک رەخنە لەفەرمانبەری گەورە دەگرێت. کەبۆیە پێناو کاری (واسطە) رازی دەبێت کەچی خۆشی هەروا دەکات - بەڵام لەئاستێکی تەسکتر. گەر کارنامەیەک (معاملە)ی برادەرێکی بێتەلای خێرا بۆی تەواو دەکات، یان برادەرێکی نامەیەکی بۆناردبێت بۆ یارمەتی دان، دواتر دەنگی خۆی بڵند دەکات و زەمی واستە دەکات و زیانەکانی باس دەکات.

هەمان شت لەبارەی خەڵک بڵێ، خەڵکی ئاسایی سەرشەقام ئاسایی گلەیی لەوەدەکات کەخەڵک درۆ دەکەن و قسە دێنن و دەبەن، گزی دەکەن و غەیبەت دەکەن، بەڵام لەبیری دەچێت کەئەویش درۆ دەکات و قسە دێنێ و دەبات و گزی دەکات و غەیبەتیش دەکات. لەگەڵ لوزەوەکە دەڕوات و دواتر سکاڵایەتی لەدەستی.

ئەم دیاردە دەروونیە باوەی عێراق دەتوانین بەوە راڤەی بکەین کەلەهۆشی ناوەوەماندا هەیە لەهاندەری چەپێندراو کەهەوڵی هاتنە دەرەوەو رەهابوون دەدات: هاندەری سێکسی چەپێندراوە لەبەر توند دەست بەحیجاب وەگرتن. هاندەری هێز چەپێندراوە لەبەر زاڵبوونی تاکڕەوی لە فەرمانداری لەعێراقدا هەرلەسەدان ساڵەوە، هاندەری ژیان چەپێندراوە بەهۆی ئەو برسیەتی و کارەسات و دەردو نەخۆشی و جەنگ و لافاوەی کەبەسەریدا هاتووە.(٤٧)بەم شێوەیە لەدەروونماندا چەندان گرێ و شتی شاراوەی چەپێندراو هەن هەوڵ دەدات لەژێر دەمامکی رەخنە یا ئاژاوەگێری یان توند نارەزایی دەربڕین خۆی

دەربخـات. رەخنەگـر لای گـرنگ نیـیـە رەخنە لەکێ دەگـرێ. ئەو دەیەوێ چەپێندراوی خۆی بشارێتەوە! زەبر ئاراستەی ئێرەو ئەوێ بکات.

ئامانجی تەنیا لێدانەکەیە نەک لێدراوەکە!.

ئەم دیاردەیەش بێگومان دەبێتە هۆی زێدەبوونی دووفاقی لەکەسایەتیدا. لەبەر ئەوەی رەخنەگرتن شێوەی بەڵگە هێنانەوەی لۆجیکی و سەلماندنی نموونەیی لە خۆوە دەگرێت.

کەواتە تاکی عێراقی بەشێوازێک رەخنە دەگرێت و بەکردەوە شێوازێکی دیکەی هەیە، دژی خۆیەتی و لێی بێ ئاگـایە. هێرشی بۆ دێنێت و جنێوی پێدەدات لەبەر ئەوەی تۆ بەرای ئەو لەهەندێ نموونە بەرزەکـان لات داوە، ویژدانی ئاسوودەیە وەک ئەوەی هیچی نەکردبێت.

**خوشکان برایان:**

پێش ئەوەی لەتوێژینەوەی کـاریگەری هۆکـاری دەروونی لەپێکهێنانی کەسایەتی تاکی عێراقیدا ببینەوە، واباشە باسی خاڵێکی یەکجار گرنگ بکەین: ئەویش کاریگەری زمانە لەو شتەدا.

لەعێراق و لەزۆر وڵاتە عەرەبییەکانی دیکەدا، تووشی شتێکی خراپ بووین، ئەویش ئەو جیاوازییە گەورەیەی نێوان زمانی باو زمانی پەتییە: لەنێوان زمانی کاری رۆژانەو، زمانی نووسین و دوانبێژی.

ئەمەیش هۆکارێکە ناکرێ پشت گوێ بخرێت لەتوێژینەوە لەکەسایەتی تاکی عێراقیداو چۆنیەتی پەیدابوونی دیاردەی دووفاقی لەو کەسایەتییەدا. زۆر لەزانایان لەسەر ئەو رایە کۆکن کەوا زمان کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر بیرکردنەوەدا. هەندێکیان بۆ ئەوە دەچن کەوا ئاخاوتن و بیرکردنەوە یەک شتن، چونکە بیرکردنەوە، بەقسەی ئەوان، خۆی لەخۆیدا قسەکردنێکی بێدەنگە. هەندێ ئەزموون لەسەر هەوکی مرۆڤدا کراوە، لەکاتی بیرکردنەوەیدا بینراوە دەلەرێتەوە وەک ئەوەی بئاخاوێ واتە پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان بیرکردنەوەو زماندا هەیە. (٤٨)

ئێمە واراهاتووین کەبەدوو زمان قسەبکەین: وەک بڵێین بەدوو شێوازی

لێک جیاواز بیرکەینەوە، ئێمە لەژیانی ئاساییدا بەزمانی باوی بازار قسەدەکەین، بەڵام کەرووبەرووی ئاهەنگێک دەبینەوە یان کەدەمانەوێت وتارێک بنوسین یەکسەر بەزمانی پەتی خۆمان هەڵدەکێشین، بەم شێوەیە دوو کەسایەتیمان لەبەردایەو بەدوو چەشن بیرکردنەوە. ئەوەشیان لامان بووە خوویێکی باو بەرادەیەک هەست بەو نەسازییەی ناکەین کەتێیدایە .

زمانی پەتی زمانی کۆشکی بلوورییە - زمانی گەردانی کاراو بەرکارو خستنە پاڵە - ئەم کاروبارانەش راستەوخۆ زۆر پەیوەندییان بەژیانی رۆژانەوە نییە. ژیانی کۆمەڵانی خەڵک و نەبوونی و بەسەر هاتەکانیان و گیروگرفت و دەروەکانیان، سوود لەگەردانی کارا یان بەرکار وەرناگرێت.

پێویستی بەزمانێکی سادەی زانستییەوە هەیە، واتایەک بگەیەنێت بێ ئاڵۆزی یان لێڵی. زمانی پەتی - عەرەبی - لەدەوروبەرێکی دەوارنشین پەیدابووە کەبەهاکانی جەنگ و گوڕو جۆشی تیایدا باوە، دواتر لەکۆشکەکانی میرو دەوڵەمەندەکان پەروەردە دەبوو بەپلەی یەکەم زمانی جۆش و خرۆشە و دووەم زمانی فیزو خۆهەڵکێشان و بێ ئیشییە.

ئەوەی زمانی پەتی - عەرەبی - دۆزیەوە ئاگاداری بوو پەرەی پێداو رێسا سەختەکانی دۆزیەوە کەسانێک بوون کەدەیانویست خۆ لەمیرو پادشاکان نزیک بکەنەوە وەک چۆن دەنگە بێژان و فرۆشیارانی کەنیزەکەکان دەیانەوێت خۆیان نزیک بکەنەوە.

میرەکە بایەخی بەزمانی پەتی نەدەدا لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانی بەڵکو لەوکاتەی کەبێ ئیش دەبوو، دوای ئەوەی لەزۆرداری کردن لەخەڵک یان دادپەروەری نواندن دەبۆوە، خۆی تەرخان دەکرد بۆ گوێ گرتن لەهەڵبەستێکی پڕ لە پێداهەڵگوتن یان گۆرانییەکی وروژێنەری خۆشەویستی بەسەرکچاندا هەڵگوتن.

لەبەر ئەم هۆیە ئەدەب و شیعرو هونەرەکانی دیکەی زمانی پەتی ئاسایی زۆرینەی خەڵک بایەخیان پێنەدەدا. تەنیا لەنێو دیوارەکانی هەندێ کۆشکی دەوڵەمەندانی پڕلە کەنیزەک دابوون. (٤٩)

زمان گەر میرەکان پشتگیریان کرد و هانیاندا باوهاوچاویان لەنێوان خۆیاندا لەسەر کرد با، ئەوا پەرەی دەسەند، گەر میرەکان بەشتی دیکە خەریک بانایە پشتگوێ دەخرا.

نموونەیەکی زیندوومان لەم بارەیەوە بینین لەسەردەمی شێخ خەزعەل میری محەمەرەی پێشوو ئەم میرە، بەدوای چێژوو خۆشی دەگەڕا بەهەموو شێوەکانی، چونکە ببوە نیازگەی زۆر لەشاعیران و دوانبێژان و ئەدیبان ئەوانەی زمانی پەتیان دەزانی و لەنێو خەڵکدا بازاریان نەبوو. ئەوانە هەڵبەستی پڕ ئاوازیان دەرازاندەوە لەپەسەندکردن و ستایش کردنی شێخ و، لەپێشدا پێشەکیەکی تێریان لەبارەی خۆشەویستی و پیاهەڵدان بەئافرەت دەخستەپێش و دەچوون بۆ موحەمرە هەبوون: جیهانی زمانی پەتی کەپڕبوو لەپەسەندکردن و بەمەزنگرتنی نموونە بەرزەکان و پرەنسیپە بالاکان، جیهانی زمانی بازار کەپڕبوو لەگیروگرفتەکانی ژیان و خەم و پەژارەو سکالا دەربڕین لەدەست شێخ خەزعل خوالێیخۆشبێت.

ئێمە ئەمڕۆ لەعێراقدا تووشی هەمان دەردهاتووین دیاردەی (فەزلیەتی): دوانبێژەکانمان دوان دەدەن و نووسەرانمان چەندان و تار دەنووسن کەپڕ لەزرینگەی شیعری و جوانکاری و رێزمانی کە زەحمەت ترین رێزمانە خوا دروست کردووە.

لەم رواڵەتکارییەو دەنگ و رەنگە لێکۆڵینەوەیەکی واقیعی گیروگرفتە زۆرەکانمان نادۆزینەوە، دوانبێژ بەپلەیەک و گەردانی کاراو بەرکار لەرستەرێک بێت زیاتر لەوەی بایەخ بەوەسفی ئەم واقیعەبکات وەسفێکی وردو راست و دروست دەکات، ئەوەیان مانای وانییە نووسەری ئەم دێڕانە لەم دەردە بەدەرە کەسکالای لەدەست دەکەین. روانینێکی شێوازی ئەو وتاربێژییەو ئەو پابەندبوونە بەرێساکانی رێزمان و گەردانی وشەو رستەکان نیشانەی ئەوەن ئێمە هەموومان لەوەدا یەکسانین.

پێش ئەوەی ئەم وتاربێژییە بڵێمەوە، گوێم لێ بوو یەکێک لە ئامادەبووان پێشی من لەوتاربێژییە کەیدا شکستی هێنا لەبەرئەوەی بایەخی بە رێزمان و

مۆرفۆلۆژی و دالانەکانی زمانی پەتی نەدباوو. گوێگری عێراقی بەتایبەتی و عەرەب بەگشتی، رەنگە لەدوانێک رازی نەبێت گەر نەزرنگێتەوەو پڕ لەوشەی گەورە گەورە نەبێت، واتە بەپێی رێزمان پەتی نەبێت، هەرچەند سوودی زانستی گەورەی تێدابێت.

کەواتە دەردێکی گشتییە بۆمان ماوەتەوە وەک چۆن چەندان دەردی دیکەیشمان بۆ ماوەتەوە، کە هۆیەکی گەورەیە لەهۆیەکانی دووفاقی کەسایەتی ئێمە، ئەم جۆرە جیاوازیە لەنێوان زمانی باوو زمانی پەتی لەئەوروپادا لەچەرخەکانی ناوەراستدا هەبوو، ئەوروپیەکان شۆڕشیان لەسەر ئەم دووفاقیەدا کرد هەر لەسەرەتای رێ نیسانسەوە، هەردوو زمانیان یەکخستن، و ئێستا تەنیا جیاوازیەکی کەم ماوە کەجیاوازییەکی سروشتیە لەنێوان زمانی رۆشنبیران و زمانی خەڵکە رەشۆکییەکە لەهەموو کات و شوێنێکدا، بەم شێوەیە دەروونیان لەدووفاقی دەربازبووە. پوختەی مەبەست ئەوەیە تاکی عێراقی دووچاری دەردێکی قووڵ هاتووە کە دەردی دووفاقی کەسایەتییە، دەشێ یەکێک بپرسێت: ئەم چارەیە چییە کەتۆ بەباشی دەزانیت بۆ ئەم دەردە؟.

ئێمە کە هۆیەکانی ئەم دیاردەیەمان زانی کەواتە باسی چارەکردن روون و ناشکرایە. دەشێ بەهەڵەدا نەچووبم کەرێگا چارەکە بەم سێ جۆرە چارەیە پێشنیار بکەم:

یەکەم: سەرپۆشی (حجاب) لەسەر نافرەت لادان و بەرزکردنەوەی ئاستی هاوبەشی کردنی نافرەت لە جیهانی پیاودا بۆئەوەی بەهاکانی پیاو و نافرەت. هیواو ئاوات و نموونەو ئامانجەکانیان وەک یەکیان لێبێت.

دووەم: کەم کردنەوەی جیاوازی نێوان زمانی باوو زمانی پەتی: وەک چۆن، خیتاب دەدەن، قسەبکەن و چۆن قسەدەکەن وتار بدەن.

سێ یەم باریگە یان باخچەی منداڵان بۆ منداڵان ئامادەبکەن، کەتیایدا خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ژیانی چاک لەژێر سەرپەرشتی پێگەیشتووانی بەتوانا.

فێریان کەن کەوا ئەو هێزەی کەجیهانی ئەمڕۆ بەرێوەدەبات هێزی تاک بەرامبەر تاک نییە یان شێر بەرامبەر شێر. هێزی زانست و پیشەسازی و

سیستەمی کارگێڕییە ئەوەی لەوەدا شکست بێنێت ئەوا لەگۆڕەپانی ژیان شکست دێنێت. هەرچەندە بڵێی لەسەر راستم و بەغوونە بالاکاندا هەڵبلێیت.
سلاوتان لێ بێت.

پاشبەند

هەندێ لەگوێگرانی دووانیێژییەکە بەرپەرچی ئەوەیان دامەوە، کەگوایە، لەکاتی توێژینەوە لەوهۆکارانەی کەبوونەتە هۆی دووفاقی کەسایەتی لەعێراقدا، باسی هۆکارێکی نوێم نەکردووە کەلەکۆمەڵگەی عێراقیدا لەنارادایە هەر لەپێکهێنانی دەوڵەتی عێراقییەوە هەتا ئەمڕۆ.

نکوڵی لەوەناکرێت کەهۆکارەکە گرنگ و شایانی لێ توێژینەوەیە، بەلام لەبەر ئەوەی لێمانەوە نزیکە بۆیە ئاڵۆزە، هەر لەبەرئەوەشە بەتێروتەسەلی لەم بوارە تەسکەدا کەتیایدابن ناتوانین لێی بتوێژینەوە.

دەشێ رۆژێکی دیکە بتوانم بەدووررودرێژی لێی بتوێژمەوە. دەشێ ئێستا ئەوەندە بەس بێت کەیەک خاڵی لێ باس بکەم و بەکورتیش.

دەشێ بەهەڵەدا نەچووبم گەر بەکورتی: بارودۆخی هەلاواردەی عێراق، کە ناکاو لەگەڵ پێکهێنانی دەوڵەتەکەیدا، رووبەڕووی بووەوە، چینێکی چەنەباز خۆ بەزلزانی تێدا دروست کرد - چینی (ئەفەندی)یان. بێگومان: چینی (ئەفەندی) یەکان لەسەردەمی عوسمانییەوە هەبوون، بەلام لەوکاتەدا ژمارەیان کەم بوون، خۆیان بەبالاتر دەزانی لەگەڵ خۆیان - بەچەشنێکی دیکە دەزانی - جیا لەچەشنی خەڵکی رەشۆکی و بازاڕییەکان. بەلام دوای پێکهێنانی دەوڵەتی عێراقی - چینی (ئەفەندی) یەکان زۆر بەفرەوانی گەوردو زۆربوون، زۆر لەئەندامانی پۆلەکانی خەڵکی رەشۆکی گرتەوە، کە رۆژێک لەرۆژن خەونیان بەوە نەدەبینی ببنە ئەندام لە چینی فەرمانڕەوا...

ئەم سەرکەوتنەو بالاچوونە ناکاوەی هەندێ لە رۆڵەکانی خەڵکی رەشۆکی بۆ پلەی فەرمانڕەوایی و ئەفسەری هەستێکی ساختەی بەخۆ مەزنگرتن یان بەبلیمەتی یان توانای موعجیزە نواندنیان لادروست بوو.

ئەوەیان کوڕە کۆلکێشە، یان تەڕەفرۆشە، لەنێوان ئێوارەو بەیانیدا، دەبێتە ئەفسەرێکی سوپاو سەربازەکان لەشەقامەکاندا سلاوی سەربازی بۆ دەکەن، یان فەرماندەر فەرمان دەداو (بکە مەیکە)ی بەدەستە بەرامبەر کەسانێک کەپێشتر لەپیادە مەزنەکانی دەژماردن. کەچی واهەست دەکات خۆی مەزنتربنی مەزنەکانە.

سەرکەوتنی ناکاو و ناسایی دەبێتە هۆی هەست بە توانستی لەرادەبەدەرکردن و هەست بەخۆ بەزلزانی.

لەبەر ئەوە دەبینین دەولەمەندانی جەنگ بەکەسی کار رایی ناکرێن (لەبەر فیزو خۆبەزلزانی). خاوەن بڕوانامەکان لەکۆمەلگەی نەزاندا بێ رادە چەنەپازو لەخۆبایین.

سەرکەوتنی پلە بەپلەی رێگای پڕ لەمپەری زۆر بلیمەت و مرۆی مەزنی راستەقینە دروست دەکات.

بەداخەوە دەولەتی عێراقی لەدروستکردنیەوە ناچار بوو زۆر فەرمانبەر دامەزرێنێت کەچی لەولاتانی دیکە، شایانی ئەوەنین بکرێنە سکالانووس.

ماوەیەک لەم ولاتەدا گەنجەکان لەخوێندنی ناوەندی یان ئامادەیی هەر دەرچووبان، بواری دامەزراندنیان لەفەرمانگە حکومییەکان لەبەردەم والابوو، شتێک لەئەلف و بێی زانستەکان فێربووە دواتر سەیری خۆی دەکات کەهەموو بەقسەی دەکەن. لەبەر ئەم هۆیە هیچ رێگرێکی نەبینی لەبەردەم داواکاریە پان و بەرینەکانی و دانانی پلانی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێک یان گێڕانەوەی شکۆمەندی باو و باپیران. دەبینین زۆرجاران پەنا دەباتە بەرزمانی عەرەبی پەتی بەوشەی گەورەو فشەل هیواو ئاواتە ئیمپراتۆرییەکانی دەردەبڕێت. ئەم رەفتارە بەئاشکرا لەهەندێ ئەفسەرانی سوپای عێراقیدا پێشی جەنگی دووەمی جیهانی بەئاشکرا لەبەرچاوان بوون لەبەر ئەم هۆیە زۆر لەفەرمانبەران لەکۆشکی بلووریندا دەژین.

گرنگ نییە گەل چەندان دەردی وەک برسیەتی و نەخۆشی و نەزانی بالی بەسەردا کێشابێت.

لەبەرئەوەی خەریکی رازاندنەوەی شەقامی رەشیدن تاوەکو گەشتیاران بێزیان نەبێتەوەو، خەریکی دانانی پلانن بۆ داگیرکردنی جیهان...

چینی (ئەفەندی)یەکانمان دووفاقیی کەسایەتیان زۆر تێدایە، لەفەرمانگە، یان لەیانەدا فەیلەسووفی ئەندێشە بازن، و جگە لەوەش خەڵکی ئاسایین... وەک من و تۆ ...

لەکۆتاییدا دەڵێم: ئەم دووفاقیەی کەهەوڵم داوە لەکەسایەتی تاکی عێراقیدا بیدۆزمەوە، بەهەمووچینە جیاجیاکانیەوە، دیاردەیەکی کۆمەلایەتییەو جێی رامان و لێ وردبوونەوەیە. وابزانم لەبوارەکانی ژیانی نوێدا بەسەرسامی دەمێنێتەوە، راڕان و هیچ ناکەین، گەر ئاوڕ لەم دیاردەیە نەدەینەوەو، دانی پێدا نەنێین و، هەوڵنەدەین بەجدی چارەسەری بکەین.

هەتا ئەم کەلێنەمان لەنێوان کارەکانمان و بیرکردنەوەمان و بانگەواز بۆ شتێک بکەیت و شتێکی دیکە بکەین، ئێمە هەروا لەم بارودۆخە ناهەموارە پڕ لەبێ ئارامی و پشێوییە بێ کۆتاییەدا دەژین.

ئەوەشیان دەردێکە پێویستی بە دەرمانێک هەیە!

سەرچاوە: ئەم نامیلکەیە وەرگێڕانی نامیلکەی « شخصیة الفرد العراقی- بحث نفسیة الشعب العراقي علی ضوء الاجتماع الحدیث - الدکتور علي الوردي بۆ سەر زمانی کوردی.

٢٠٠٠/٨/٢٧

## پەراوێزەکان

(١) بږوانە محمد عطیة الاطرشي، الشخصیة:ص٩

(٢) بڕوانە K. Yourg, petsohality...p. 3

(٣) بڕوانە KLuckhon Murray, persondlity... p. 27

(٤) ئەم ئەنجامگیرییەی کەئیبن خەلدون پێیگەیشتووە دەتوانرێت لەسەر ئەو شارستانیەتەی کەئەو تیایدا ژیاوە پەیڕەویکرێت بەجۆرێک ئەوکاتە دەتوانرا خەڵکان بۆ دووبەشی پێچەوانە پۆلین بکرێن:
خەڵکانی سەردارو خەڵکانی ژێردەست، خاوەن شمشێرو خاوەن پیشە، یان وەک (فبلن) دەڵێ: شەڕکەرو بەرهەمهێن. بەڵام ئەمڕۆکە ئەم پۆلین کردنە ناکرێ لەسەر شارستانیەتی ئێستای ڕۆژئاوا پەیڕەوبکرێت، بەجۆرێکی وا کەشمشێرو پیشەیەکیان گرتووە یان هەروەها ئیبن خەلدون سەلماندی کەوا زانست و هونەرەکان تەنیا لەکۆمەڵگەی هەڵوەساوە پەیدادەبێت کەلەهەمان کات نارەزووی تاوان و هەوەس بازی و بەرەڵلای تێدا پەیدا دەبێت. بۆ ئەوەش چووە کەوا کۆمەڵگەی کۆچەری هەرچەندە دووریش بن لەزانست و پیشەسازی بەڵام لەهەمان کاتدا هۆکاردکانی گەندەڵی تاکەکەسی و هۆیەکانی خراپەکاری تێدانیە، چونکە کۆچەری لەگۆشەنیگای ئەوجدا رەسەنترو نزیکترە لەگیانی ناییندارى و چاکەخوازی وەک لەکەسێکی شارستانیدا، بەدەستەوڵژیەکی دیکە، زاڵبوون و بەرهەمهێنانی دوو مەسەلەی هاوتان بۆیە هیچ نەتەوەیەک ناتوانێت بێتە نەتەوەیەکی سەرور لەململانێی نێودەوڵەتیدا ئەگەر لەمەیدانی پیشەسازی و زانستیدا باڵا دەست نەبێت.
ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کەلەسەدەکانی کۆن و ناوەڕاستدا ڕوویاندەدا، چونکە خاوەن شمشێر رقی لەوە دەبووەوە کەببێتە خاوەن کار یان زانا. ئەوکاتەش بەسازکاری دەوت (پیشە = مهنة)کەلەزمانی عەرەبیدا واتای شتێکی بێ بەهاو نابەسەندی دەبەخشی بڕوانە (ئیبن خەلدون. المقدمة ص٥٤٤).

(٥) بڕوانە ئیبن خەلدون. المقدمة ل ١٢١... ئەوانی دیکەش)

(٧) بڕوانە: الدكتور محمودحسب الله . الحياة الوجدانية والعقيدة الدينية. ص٣٧٥، وما بعدها.

(٨) بڕوانە، دکتۆر صبری جرجیس، مشكلة السلوك البسيكوباتي. ص١٩٦.

(٩) بڕوانە روبرت ودروث. علم النفس (ترجمه عبدالحميد كاظم) ، ص٢١٨ وبعدها.

(١٠) بڕوانە R. Linton. The stady of man, ch. 37

(١١) Mottran, The physiccal Bassax plosnality, p. 57

(١٢) Tyrell, Peronality of man, p. 25

(١٣) Sorokin, The crisis of out age, ch. 30

(١٤) H. Fox, The personality of Animals

(١٥) يوسف مراد. مبادىء علم النفس العام. ص٣٣٩

(١٦) بڕوانە: محمد عطية الابرشي، الشخصية. ص٢٢٦ - ص٢٢٧.

(١٧) Sargent, op. cit. , p. 68

(١٨) بڕوانە هەمان سەرچاوە. يوسف مراد. ص٣٣٧

(١٩) Joad Guide To Philosophy. p. 230 et. Seq

(٢٠) Landis Social control, p. 60

(٢١) بڕوانە ، شاكر الخفاجي. كيف تكون منوماً مغناطيساً، ص ٢٥ - ٢٠٧.

(٢٢) Landis, op. p. 66

(٢٣) الغزالي. المنخذ من الضلال. ص٧٥

(٢٦) Dawson and Gettys, Introducto to socialoyy, p. 16

(٢٧) جاحز چەندان تایبەتمەندی هەر نەتەوەیەی سەردەمی خۆی ژماردن، وتی: تایبەتمەندی خەڵکی چین:

پیشەسازیە.. یۆنانیەکان: هۆیەکەی دەزانن بەڵام کاری پێ ناکەن، بەحوکم و ناداب هەڵداوێردرین، عەرەب توانایان ئارلستەی شیعر وتن کردووە، و رەوانبێژی لۆجیکی، دارشتەی زمانی، و رێبازو دۆزی ناخاوتن و بەژن و باڵای مرۆڤ دوای بەژنی شوێنکارەکەی و، پاراستنی رەچەڵەک و ئەستێرە دۆزی، و شوێنهەڵگرتن و، کەشناسی و شارەزایی لەنەسەب، چەک و ئامێری مەبەست ئەوەنییە بڵێم کەوا تاکەکەس هەموو تایبەتمەندییەکانی کەسایەتی لەو کۆمەڵگەیە وەردەگرێت کەتیایدا دەژێت، لەبەر ئەوەی لەقووڵایی هەر کەسایەتیەک بەشێکی شاراوە هەیە کەناکەوێتە بەر رێسای کۆمەڵگا یان مل کەچی سرووش و تێفرۆساندنی نابێت. ئەم بەشە کەوا دەکات هەرتاکە کەسێک جیاوازێت لەکەسانی دیکەی پێکهاتەی کەسایەتیەکەی جەنگ و لەبەرکردنی هەموو بیستەنیەک و پەند وەرگرتن لەهەموو بەرهەستێک، و رێکهێنانی بابەتی پێهەڵگوتن و خەوش دەرخستن لەم لایەنەوە گەیشتنە چلە پۆپە. تایبەتمەندی بنەماڵەی ساسانیەکان، لە پادشایەتی و سیاسەتدایە، تورکەکان: لەجەنگ و .. و رەشپیستەکان: سرۆشیان لەسەرماو تەپڵ لێدان دا بە .. هیندەکان بەژمێرکاری و ئەستێرەزانی و نهێنیەکانی پزیشکی بەناوبانگن (بڕوانە ضحی الاسلام بەشی (١) لاپەڕە ٥٠٦)

K. young . Personality.., p. 279(٢٨)

Mead, Mind, Self. and Society. p. 173(٢٩)

K. young. Social psychology (٣٠)

(٣١) سەرم سوڕما لەودیاردەیەی کەلەوڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکادا بینیم، کەلاوەکانیان لەکاتی جەنگ خۆبەخشن بۆچوونە ریزەکانی سوپا، لەگەڵ ئەوەی کەهەموو ئەمەریکیەک دەتوانێت بەیاسا مافی ئەوەی هەیە نەچێتە ریزی سوپاو نەبێتە سەرباز بێ ئەوەی هیچی بێتەسەر. بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کەلەئەمەریکا بووم لەکەس گوێ لێ نەبوو بانگەواز بۆ خۆشەویستی نیشتمان یان ئەرکی خۆبەخت کردن لەپێناوی نیشتمان دا بدات ئەوان لەناخاوتیان دا نیشتمان لەبیردەکەن بەڵام بە کردەوە خزمەتی دەکەن بەڵام لەعێراقدا، ئەوا زێدەرۆیی ناکەین گەر بڵێین هەریەک لەئێمە دووکەسایەتی هەیە: کەسایەتیەک ناخاوتنە پان و پۆرەکانی و بانگەوازە دوورو درێژەکانی پێ دەردەبڕێت، و کەسایەتیەکی دیکەش بەو شێوەیە کاردەکات کەهەڵکەوت دەیسەپێنێت و ئەوان بانگەوازو ناخاوتنان لەبیردەکات. هەندێ شیکاری دەروونی دەڵێت: ئەوەی کەزۆر شتی لە ناخاوتەکانیدا دووپات دەکاتەوە لەڕاستیدا لێی دڵنیا نیە، ئەوەندە باوەڕی پێی نییە، کەسی خۆویست زۆر لەبارەی ئیدیی خوازی (الغیرە) دەدوێت، کەە دارایی لەهەموو بۆنەیەکدا لەبارەی داراییەکەی دەدوێت، کەسێک کەهەست بەکەم و کوڕی بکات خۆبەمەزند گرێت و فیز دەنوێنێت، ئیدیی خوازی باسی دڵ شادی دەکات و رەخنە لەکەسانی دیکەی دژ دەگرێت، چەسپاندنی هەندێ هاندەری دەروونی و خستەرووی پێچەوانەی ئەوان، هەندێ جار دەبێتەهۆی پەیدابوونی دووفاقی لەکەسایەتی، هۆشی ئاوەوە گەر ئارەزوو دەکات و داخوازیەکانی چەپێندران، گلدرانەوە، کە کۆمەڵگە ناچارمان دەکات نکوڵیان لێ بکەین، دەریان نەبڕین، هەندێ جار بەسەرماندا زاڵ دەبێت و کەسایەتی ئاساییمان لەبیردەکەین و لەکەسایەتیەکی دیکە خۆ دەردەخەین بۆ پشوودان (بڕوانە سەلامە موسی، هۆشی من و هۆشی تۆ ل٥٧).

(٣٢) زۆر لەدەقی کەلەپووری ئایینی خاوەن بەهایەکی زانستیە لەتوێژینەوە کۆمەڵایەتیە نوێکان. ئێمە لێرەدا لەچیرۆکی ئادەمدا ئەوە گرنگ نیە، بۆ توێژینەوەکەمان لەقوڕ دروستکراوە یان مەلائیکەت کڕنووشیان بۆ برد تەنیا ئیبلیس نەبێت رازی نەبوو خۆی بەزل گرت، ئەوانە کاروبارێکن لەدەرفەتێکی دیکەدا دێینەوە سەریان بۆ لێتوێژینەوەیان ئەوەی گرنگە ئێستا ئەوەیە کە دەقە ئاینیەکان لەبارەی ئادەمەوە هاتووە کەوا خەڵکی فێری کشتوکاڵ کرد یان پیشەکەی کشتوکاڵ کردن بوو، لە پێغەمبەرەوە